# ڕۆڤار

ژمارە ٧٧

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

Web Site
www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.sardam@gmail.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

پۆستەر و مۆتیف و هێڵکاری ئەم ژمارەیە
ئامانج مەردۆخی

بەرگ- ئاکۆ غەریب




## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەڕەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، شێرکۆ بێکەس.

# پێڕست

# پێشەکی

## سالم لە ڕۆڤاردا

**کەس نەبێ سالم لە دنیادا وەکو تۆ تووشە دەرد**
**بێ نەوا کەوتوومە غوربەت ناتوان و ڕەنگ زەرد**
**لێم گەڕێن با گریەکەم  دیدەم دیدەی خونفشان**
**نایەڵێ یەکدەم بە ڕاحەت ڕابوێرم ئاسمان**

*ئەم ژمارە نوێیەی ڕۆڤار، تایبەتە بە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی شیعری کوردی و سێ کوچکەی شیعری بابان، کە ئەویش (سالم)ی ساحێبقرانە. پێشتر ڕۆڤارمان بۆ (نالی و کوردی) دەرکردووە، هەموان چاوەڕێی سالم بوون، ئەم ژمارەیەش کۆتایی هێنا بە چاوەڕوانی ئێمە و خوێنەرانی گۆڤارەکەمان. ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار وەک زۆرێک لە ژمارەکانی تر بەدەر لە ئامادەکردن و کۆکردنەوەی چەندین بابەت و لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ئەم شاعیرە، چەند دەستنووس و نامەیەکی جیاوازمان لەسەر ئەم شاعیرە و جیهانبینی و شێواز و ڕیتواڵی شیعرەکانی بڵاوکردۆتەوە، سالمیش وەک بەشێکی زۆری شاعیرانی کلاسیکی کوردی شیعر و شێوازی شیعرنووسین و کەشکۆڵی شیعرەکانی لەلایەن نووسەران و توێژەرانی ئەدەبی کوردییەوە جێگەی باس و لێکۆڵینەوە و بۆچوونی جیاوازە، بۆیە لەم ژمارەیەدا ڕەنگدانەوەی ئەو جیاوازییە لەسەر شیعر و بەرهەمەکانی سالم دەبینرێت، ئەمەش لانیکەم دەرفەت بۆ خوێنەر دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی بەسەربەخۆیی خۆیان بڕیار لەسەر شێواز و تایبەتمەندی شیعرەکانی ئەو شاعیرە بدەن و جیای بکەنەوە لە تایبەتمەندی شاعیرانی تری کورد.

*هەندێجار لێرە و لەوێ هاوڕێیان و خوێنەرانی ڕۆڤار ڕەخنەی ئەوە دەگرن کە با ڕۆڤار بۆ شاعیرانی کلاسیکی کوردی  دەرنەکەین، بەو پێیەی لە ڕابردوودا دەیان گۆڤار و بڵاوکراوەی تایبەت، هەڵوێستەیان لەسەر شیعر و جیهانبینی ئەو شاعیرانە کردووە، ئیدی پێویست ناکات جارێکی تر ڕۆڤار هەمان کاری ئەوان بکات، دەڵێن وا باشترە نووسەران و هونەرمەندانی تری کورد بەسەر بکاتەوە، وەڵامی ئێمە بۆ ئەو ڕەخنە و پێشنیارانە ئەمەیە، کە ڕۆڤار لەسەرەتاکانی دەرچوونییەوە تا ئێستا بە ستایل و شێوازێکی تایبەتمەندانە دەرچووە، کە ئەویش هەر ژمارەیەکی تایبەتە بە کەسایەتییەکی داهێنەری بوارەکانی ئەدەب و هونەری کوردی، ئیدی ئەو کەسایەتییە گەلێک شتی لەسەر نووسرابێت یان کەم، ئەمە لای ئێمە پێوانە نییە، پێوانە بەرهەم و شاکارەکانییەتی، ناکرێت ئێمە دەیان کەسایەتی ئەدەبی و هونەریی لە ڕۆڤاردا بەسەر بکەینەوە و سالم و نالی و کوردی و مەحوی و بێسارانی و دەیان ناوی تر فەرامۆش بکەین.!

*دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە شیعری کلاسیکی کوردی لە ئەدەبیاتی ئێمەدا زۆر لەوە کەمتری بۆکراوە کە پێویستە بکرێت.ئەو ڕاستییەشمان لەبەرچاوبێت کە شیعری کلاسیکی کوردی بەهۆی هەلومەرجی ئەو قۆناغەی ڕابردوی ئەدەبی کوردیی و نەبوونی چاپ و پشتبەستن بە تەنیا بەدەستنووسی هەمەجۆری ئەم و ئەو، گەلێک هەڵە لە شیعرەکاندا کراوە، تەنانەت هەندێ جار قەسیدەیەک کە لەلایەن دوو کەسەوە نووسراوەتەوەو لە یەکتریش ناچن، یان جیاوازی زۆریان هەیە، بۆیە لای ئێمەشەوە هەروا شکاوەتەوەو نەماتوانییوە لەو چەند شیعرە لێکچووانە دانەیەکیان  ساغبکەینەوە.

*لە ژمارەکانی پێشووی ڕۆڤاردا چەند ژمارەیەکی کەممان بۆ نووسەران و هونەرمەندانی زیندوو دەرکردووە، هەرچەندە پێشووتر ڕۆڤار تەنها بۆ کۆچکردوان بوو، بۆیە بەنیازین ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار بۆ پرۆفیسۆر دکتۆر عێزەدین مستەفا ڕەسوڵ بێت، بۆ ئەو مەبەستەش لێرەوە چاوەڕێی هاوکاریی لە هەموو لایەک دەکەین بۆ دەرکردنی ئەو ڕۆڤارە تایبەتە بەو پرۆفیسۆرە کوردە.

**بەڕێوەبەری نووسین**

# سالم-ی شاعیر (عەبدولڕەحمان بەگی ساحێبقڕان) کێیە؟



مێژووی لە دایکبوون و شێوازی ژیانی بەشێکی زۆری شاعیرانی کلاسیکی کوردیمان وەک پێویست ڕوون و ئاشکرا نییە، ئەمەش یەکێکە لە نەنگییەکانی ئەو بوارەو تا هەنووکە نەتوانراوە بەشێوەیەکی میتۆدی ورد و باوەڕپێکراو شێوازی ژیان و گوزەران و ئەو قۆناغەی شاعیری تێدا ژیاوە ساغ بکرێتەوە، یەکێک لەو شاعیرانەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی (سالم)ی شاعیر، یەکێک لە سێ کوچکەی شیعری بابانە کە تا هەنووکە ژیاننامەکەی تەنها چەند وێستگە و لایەنێکی سنووردارە.

ئەوڕەحمان بەگی مەحموود بەگی ئەحمەد بەگی ساحێبقڕانە. شاعیرێکی مەزن و هەرە بەرزی کلاسیکی کوردە و ڕێبەری قوتابخانەی شیعری بابانە. لە شاری سلێمانی لەدایک بووە. بە منداڵی لە مزگەوتەکاندا، لەلای مەلا فێری خوێندن بووە. بۆ خوێندن گەلێ شوێنی کوردستان گەڕاوە، تاکو مەلایەکی چاک و شارەزا لە فەقێی ئیسلامی لێدەرچووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، بەڵام بەهۆی تێکچوونی میرنشینی بابان و ئـاژاوەوە، سلێمانی بەجێدێڵێ و ڕوودەکاتە تاران، لەوێش پاش هەست کردن بە ئاوارەیی نەحەساوەتەوە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. دوای داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن عوسمانیەکانەوە، ئاوارەی خوارووی عێراق بووەو بۆ حلە دوورخراوەتەوە وەکو موچەخۆرێکی میری، دوای دەسبەسەرییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. ئەو نەهامەتییەی گەلی کورد زۆر کاری تێکردووە، و زۆر خەفەتی خواردووە، شاعیرێکی نیشتمانپەروەری ڕاست و درووست بووە. یەکێکە لە شاعیرەکانی دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری کلاسیکی. بە خوێندنەوە پلەی هەستی هۆشمەندی و خوێندەواری خۆی بەرزکردۆتەوە. بە دووەم کۆڵەکەی ئەدەبی کوردی دوای نالی دادەنرێت. سالم لە سەرەتادا نازناوی شیعری «ڕەنجووری» و «بیمار»ی بۆ خۆی دانابوو. بەڵام پاشان گۆڕی بۆ سالم. شیعرەکانی زۆر بەرزو شیرین و دڵگیرە، کە بریتییە لە شیعری نیشتمانپەروەری و دڵداری و کۆمەڵایەتی و ئاینی. شۆڕشێکی گەورەی لە شیعری کوردیدا بەرپاکردووە، و «جناس»ی تیا بەکارهێناوە. لە زمانی فارسیشدا دەستێکی باڵای هەبووە. دیوانی شیعریی لە ١٩٢٣دا چاپکراوە.تا ئێستاش چەندین لێکۆڵەرەوەی کورد شیعرەکانیان ساغکردووەتەوەو چەندین دیوانی جیاوازی هەیە و یەکێکە لەو شاعیرانەی کورد کە شیعرەکانی زۆرترین قسە هەڵدەگرێت و گفتوگۆی هەمەلایەنەی لەسەر دەکرێت، لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووەو تا هەنووکە کاتێکی ڕاست و درووستی مێژووی کۆچی دواییەکەی نادیارە.



**لە کونجی میحنەتا هەر شەو خەیاڵی وەسڵی دولبەر کەم**
**وجوودم وا بە جارێ دێتە جوش، وەختە پەڕ دەرکەم**
**لە ئەوەڵ حەرفیا وەك دڵ لە کاغەز بەر دەبێ ئاگر**
**ئەگەر شەرحی شەرارەی ناری هیجرت سەبتی دەفتەر کەم**
**تەڵاشی تەی راهی کەعبەیی کۆی یارە، مەقسوودم**
**منی بێ دەست و پا، لازم کە پا بۆ ئەم رەهە سەرکەم**

# بیبلیۆگرافیای سالم-ی شاعیر

## (عەبدولڕەحمان بەگی ساحێبقڕان)

## لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا



ئامادەکردن: بوار نورەدین

هەروەک لە ژمارەکانی دیکەی ڕۆڤاردا، ئاماژەمان بە چەند خاڵێک کردبوو، وا لەم بابەتەشدا و بەهەمان شێوەی بابەتەکانی پێشوو، هەندێ سەرنج و تێبینی دەخەینەڕوو. هەرچەند لەلایەکەوە ڕەنگە پێویست نەبێت و لەلایەکی دیکەشەوە پێویست بێت؟ چونکە دووبارەکردنەوە لە نووسیندا پێویست نییە، لە هەمان کاتیشدا هەریەک لە ژمارەکانی (ڕۆڤار) بەشێوەیەکی سەربەخۆ چاپ و بڵاو دەکرێنەوە، لەبەرئەمە پێمان باشتر بوو کە — بەشێوەیەکی کورتر- دووبارە بکرێنەوە:

١- ئەو بیبلیۆگرافیایەی کە چەند ساڵێکە کاری لەسەر دەکەین، تەنها لەبارەی (کتێبی کوردی)یەوەیە -لە سەرەتاوە تاکو ساڵی ٢٠١٠-، هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنها ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەک (کتێب) دووبارە چاپ کراونەتەوە. لەهەمان کاتدا، جگە لە کتێب بە زمانی کوردی، هیچ زمانێکی تری نەگرتووەتەوە.

٢- لە ئامادەکردنی دەستنووسی (بەرگی سێیەم- ئەدەب)دا، (دیوان)ی شاعیرانی نەگرتووەتەوە، هەروەها ئەو کتێبانەشی نەگرتووەتەوە کە تەنها بەرهەمی شاعیرانیان کۆکردووەتەوە، بێگومان لەبەرئەمەیە کە لێکۆڵەران لە دۆزینەوەی دیوانی شاعیراندا دانامێنن... بەڵکو ئەوە بەلامانەوە جێی بایەخ بووە کە نووسەران و لێکۆڵەران لەو بابەتانە ئاگادار بکەینەوە کە لەبارەی شاعیرانی کوردەوە نووسراوە؟ لەهەمان کاتدا، ئەو دیوانانەی گرتووەتەوە کە جگە لە کاری کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەم و هۆنراوەی شاعیرانی کورد، کاری لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەشیان ئەنجام داوە.

٣- لە ئامادەکردنی ئەم بیبلیۆگرافیایەدا، بەناو هەموو بەرگەکانی بیبلیۆگرافیاکەدا گەڕاین، ئەمەش کارەکەی باشتر کردین، کە بەداخەوە بۆ (کوردی)ی شاعیر تەنیا بەناو دەستنووسی (بەرگی سێیەم- ئەدەب)دا گەڕابووین، بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەم هەڵەیەش بۆ کێشەی نووسین و پۆلێنی کتێبی کوردی دەگەڕێتەوە.

٤- ئەم بیبلیۆگرافیایە بەپێی ساڵ ئامادە کراوە. لە ناسنامەی کتێبەکاندا، ئەم چەند هێمایە بەکارهاتوون: (چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم، چ: چاپخانە، ش: شوێن، س: ساڵ، ل: لاپەڕە، ق: قەوارە «بە سانتیمەتر»). هەروەها بۆ هەر سەرنج و تێبینییەکی تر لەبارەی ناساندنی سەرچاوەکانەوە، خوێنەر دەتوانێت بۆ ئەم کتێبە بگەڕێتەوە: بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان: ١٩٢٥- ٢٠١٠ «بەرگی یەکەم: مێژوو»، ئامادەکردن: بوار نورەدین، چاپی یەکەم- چاپخانەی «سەردەم» سلێمانی- کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٢.

٥- لەم بیبلیۆگرافیایەدا، بە پێچەوانەی بیبلیۆگرافیا سەرەکییەکە، ناونیشانی کتێبەکانیش بەپێی ڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.

سەرەتا ئەو کتێبانە دەناسێن کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریان لەسەر (سالم)ی شاعیر کردووە:

### ١. سالم لە تای تەرازووی ویژەدا- لێکوڵینەوەی ویژەیی

نووسین: ئەحمەد سالار

چاپ: یەکەم، چ (ژین)، ش: سلێمانی، س: ١٩٦٨، ل: ٤٨، ق: ١٣×١٨.

ناوەرۆک:

سەرەتا/ سالم کێیە؟/ ژیانی و ڕابواردنی/ شێوەی سالم/ سۆزی نیشتمانی/ پایەی بوێژی/ ڕێوشوێنی لە هۆنراوەدا/.

### ٢. دوو چامەکەی نالی و سالم ((خودی چامەکان، گوزارەکانیان، لێکۆڵینەوەیان، قسەکردن لە جیایی دەستنووسەکانیان، بەراوردکردنیان بۆ دەرخستنی مێژووی دانانیان، ڕوونکردنەوەی سەردەمی نالی و سالم.))

نووسین: عەلائەددین سەجادی

چاپ: یەکەم، چ (مەعاریف)، ش: بەغدا، س: ١٩٧٣، ل: ١٤٤، ق: ١٧×٢٤.

ناوەرۆک:

وردبوونەوەیەک لە دوو چامەکەی ناڵی و سالم/ ناڵی ١٧٩٧- ١٨٥٥/ چامەکەی ناڵی/ گوزارەی هۆنراوەکان (لەناوەرۆکدا

نەنووسراوە- هەروەها لە ناوەرۆکدا بۆ ل٤٨ نووسراوە: خانەقای مەولانا خالید کە لە لاپـەڕەی نـاوبـراودا ئەو ناونیشانە نییە؟)/ چامەکەی سالم ١٨٠٠-١٨٦٦/ گوزارەی هۆنراوەکان/ ڕوونکردنەوەیەک/ نالّی کە لە سولەیمانی دەرچووە؟/ ستوونی ڕاست و چەوت/ ناواخن.

## ٣. نامەی ژیان- دوو چامەکەی: کەمالی و ناتیق لەژێر تیشکی دوو چامەکەی نالی و سالم دا

نووسین: ئاوارە (ساجد ئاوارە)
لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
چاپ: یەکەم، چ (ئیرشاد)، ش: بەغدا، س: ١٩٨٥، ل: ١٥٥، ق: ١٦×٢٣.
ناوەرۆک:
پێشەکی/ بەشی یەکەم: کەمالی/ ناتیق/ کەمالی و ناتیق/ نالی و سالم/ نالی و چامەکەی/ دەقی چامەکەی نالی/ سالم و چامەکەی/ دەقی چامەکەی سالم/ بەشی دووەم: دووچامەکەی (کەمالی و ناتیق) لە ژێر تیشکی (نالی و سالم)دا/ بەشی سێیەم: باری ژیان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و نەریتی دانیشتوانی دەشتی شارەزوور لە سەردەمی (نالی و سالم) و (کەمالی و ناتیق)دا/ بەشی چوارەم: گوزارە و ڕاڤەکردنی دوو چامەکەی کەمالی و ناتیق/ پاشکۆ: ناتەواوی لە دوو چامەکەی کەمالی و ناتیقدا/ چاوپێکەوتن/ ساجد ئاوارە (هۆنراوە)/ سەرچاوەکانی ئەم کتێبە/ ناوەرۆک/ چەند هەڵەیەکی بچووک/ ڕاستکردنەوە/ ئەم دێڕانە نوقسانن.

## ٤. شێواز لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا- نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم لە ناوچەی سلێمانی

نووسین: حەمە نووری عومەر کاکی
لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی
چاپ: یەکەم، چ (تیشک)، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٨، ل: ١٤٠، ق: ١٧×٢٤.
ناوەرۆک:
ناوەڕۆک/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: شێواز/ بەشی دووەم: شێوازی شیعری کلاسیکیی کوردی/ بەشی سێیەم: شێواز لە بەرهەمی شیعری نالی و سالم و کوردی/ سەرچاوەکان/ پوختەی بابەت بە زمانی ئینگلیزی.

## ٥. فەرهەنگی دیوانی شاعیران- نالی- سالم- کوردی

نووسین: د. محەممەد نوری عارف
لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٩، ل: ١٠٢٤، ق: ١٧×٢٣.
ناوەرۆک:
بۆ ناوەرۆکی ئەم کتێبە بڕوانە ڕۆڤاری تایبەت بە کوردی شاعیر- ژمارەی پێشتر...

## ٦. هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی لێكۆڵینەوەی (دیوانی سالم)دا

نووسین: محەممەد عەلی قەرەداغی
لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی
چاپ: یەکەم، چ (حاجی هاشم)، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٩، ل: ٧٤، ق: ١٧×٢٤.
ناوەرۆک:
پێشەکی/ باسێکی دەستخەتەکە/ کاری من بۆ ئەم دەستخەتە/ هەندێک لە سەرچاوەکانی دیوانی سالم/ کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵی/ کەشکۆڵی تۆفیق/ کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵڵای قزلجی/ کەشکۆڵی گوڵزاری بەهار/ کەشکۆڵی سەید محەممەد/ کەشکۆڵی نەناسراو/ مینای شکستە/ هەجوییات/ بەیتە تاک و جووتە بڵاونەکراوەکان/ بەشی فارسی/ وێنەی دەستخەتەکانی دیوانی سالم/ بابەت و سەرباسەکان.

## ٧. بەرکورتێك لە خەرمانی شیعری سالم- چەپكێك شیعری بڵاونەكراوەی سالم- پاشكۆیەكی دیوانی نالی

نووسین: محەممەد عەلی قەرەداغی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ (ئاراس)، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠، ل: ٢٦١، ق: ١٣×١٩.
ناوەرۆک:
بابەت و سەرباسەکان (نـاوەرۆک)/ ڕوونکردنەوەیەک/ وتەیەکی کـورت و پێویست/ مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم و ئەم شیعرانەی نالی و سالم/ پرۆژەی لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی سالم/ پێشەکی هەنگاوێک لەسەر.../ باسێکی دەستخەتەکە- دەستخەتی ئەحمەد ئاغا/ کاری من بۆ ئەم دەستخەتە/ هەندێک لە سەرچاوەکانی دیوانی سالم/ ١- کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەڵی/ ٢- کەشکۆڵی تۆفیق/



٣- کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵڵا قزڵجی/ ٤- کەشکۆڵی گوڵزاری بەهار/ ٥- کەشکۆڵی سەید محەممەد/ ٦- کەشکۆڵی نەناسراو/ باسێکی دەستخەتەکە- دەستخەتی عەلی ئەکبەری سنەیی/ فیهرەستێکی دەستخەتەکە و سەرەتای پارچە شیعرەکان/ چیم بۆ ئەم شیعرانە کردووە یەک دوو نموونەی جیاوازی/ شیعرەکان.../ شاکارێکی بڵاونەکراوەی سالم- عەبدوڵڵا پاشا و سالم- عەبدوڵڵا پاشا لە سەرچاوەیەکی تردا/ شیعرەکان.../ بەشی فارسی/ پاشکۆیەک بۆ نالی/ وتەیەک/ نالی و بیری نەتەوایەتی/ کڵاوڕۆژنەیەکی تازە بۆ ژیانی نالی/ سێ کوچکە و سێ پایەی شیعری کلاسیکیی کوردی سەردەمی بابان/ هەڵوێستێک لە عاستی پارچە شیعرەکەی نالیدا/ نالی کەی ئەم پارچە شیعرەی گوتووە؟/ پارچە شیعرەکەی نالی.

**ئەمانەش ئەو کتێبانەن کە بەشێوەیەکی تر ناوی (سالم) یان هێناوە یان لێکۆڵینەوە و بابەتیان لەسەر نووسیوە:**

١. تەئریخی سلێمانی وە وڵاتی- لە دەوری زۆر قەدیمەوە تا ئەوەلی ئیحتیلال (١٩١٨م)/ نووسین: محەممەد ئەمین زەکی بەگ، چاپ: یەکەم، چ (النجاح)، ش: بەغدا، س: ١٩٣٩،: موتاڵەعەیەکی کورت دەرحەق بە ئیمارەتی بەبە/ عەشایەری وڵاتی سلێمانی/ مەشاهیری وڵاتی سلێمانی/ عەبدولڕەحمان بەگ (سالم).

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی- مێژوو، ئەدەب، زانیاری/ نووسین: عەلائەددین سەجادی، چاپ: یەکەم، چ (مەعارف)، ش: بەغدا، س: ١٩٥٢: دەوری دووەم لە ئەدەبی کوردی/ هۆنراوە (شیعر)/ هەڵبەست لە کورددا/ سالم.

٣. بەرگی دووەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی- باسی ئەم بوێژانەی کورد و شیعرەکانیان بخوێنەوە: دڵدار- ڕەمزی- (سالم)- سەلام- عەلی باپیر ئاغا- گۆران- نوری شێخ ساڵح/ نووسین: ڕەفیق حیلمی، چاپ: یەکەم، چ (الشباب)، بەغدا، س: ١٩٥٦: سالم (ئەوڕەحمان بەگ)/ غەرامیاتی سالم/ سالم و عەزیز بەگی بابان.

٤. باخچەی شاعیران- بەسەرهات و هەڵبەستی ٤١ بوێژی کورد/ کۆکردنەوە و لەسەر نووسین: عەبدولعەزیم ماوەتی و عەبدولقادر ساڵح، چاپ: یەکەم، چ (ژین)، سلێمانی، ١٩٧٠: پێشەکی: شاکر فەتاح/ کورتەی ژیان و نموونەی بەرهەمی ٤١ شاعیری کورد...: سالم ١٨٠٠- ١٨٦٦.

٥. پێناسی بەشێکی شاعیرانی کورد- بەسەرهات و ژیانی (٤٢) شاعیری ناوداری کوردە/ نووسین: ئەسعەد عەدۆ، چاپ: یەکەم، چ (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٠: مەبەستم لە کۆکردنەوەی سەرگوزشتەی ئەم چەند شاعیرە چییە؟/ سالم.

٦. تێکستی ئەدەبی کوردی- بەشی دووەم- زانستگای سلێمانی کۆلیجی ئاداب بەشی زمانی کوردی، نووسین: د. محەممەد نووری عارف، لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ (زانکۆی سلێمانی)، سلێمانی، ١٩٨١: پێشەکی/ بەشی یەکەم: تێکستی هۆنراوەی کۆن بە شێوەی کرمانجی خواروو/ سالم.

٧. لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە- بریتییە لە چواردە لێکۆڵینەوە/ نووسین: د. مارف خەزنەدار، چاپ: (یەکەم)، چ (المؤسسه العراقیه للدعایه والطباعه)، بەغدا، ١٩٨٤: شیعری بەرزی هەندێ لە شاعیرە کەم ناسراوەکانی کورد: پێنجین و پێنج خشتەکی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا: پێنجین/ پێنج خشتەکی/ پێنج خشتەکیی سالم لەسەر شیعری نالی/ مولەممەع لە شیعری کلاسیکی کوردیدا: نالی/ سالم/ کوردی/ بۆ مەبەستی چاپێکی زانستیی دیوانی سالم: چاپی دووەمی دیوانی سالم/ دەستکاری و هەڵە لە چاپی دووەمی دیوانی سالم/ پەراوێزێکی چاپی یەکەمی دیوانی سالم- سەرچاوەیێکی گرنگ.

٨. دیداری شیعری کلاسیکی کوردی/ نووسین: حەمە سەعید حەمە کەریم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ (دار الحریه)، بەغدا، ١٩٨٦: پێشەکی و ڕوونکردنەوە/ سالم لە ڕێبازی کلاسیزمدا: حەسیب قەرەداخی/ سەرەتایەک بۆ لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکی کوردی: کەمال میراودەلی/ پایەی شیعری کوردی لە ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەهەمدا: مەسعوود محەممەد.

**تێبینی:** ئەم کتێبە دیدارێکی تایبەت بە شیعری کلاسیکی کوردی بووە کە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە ١٤- ١٦/٤/١٩٨١ لە سلێمانی سازی کردووە.

٩. شیعر و ئەدەبیاتی کوردی/ نووسین: ڕەفیق حیلمی، چاپ: دووەم، چ (التعلیم العالی)، بەغدا، ١٩٨٨: ئەم کتێبە چاپی دووەمی هەردوو بەرگی پێشتری کتێبەکەیە کە لە بەرگی دووەمدا باس لە (سالم) کراوە بڕوانە کتێبی ژمارە ٣.

١٠. مێژووی وێژەی کوردی- نووسراوی ٢/ نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفیزادە)، لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی (ناجی) لە بانە، چاپ: یەکەم، چ (چهر تبریز)، تەورێز، ١٣٧٥ (١٩٩١): هۆنەرانی دەوری بابان: ئەوڕەحمانی سالم.

١١. سلێمانی شارە گەشاوەکەم- بەرگی یەکەم/ سلێمانی لە ڕۆژی بنیاتنانیەوە تا کۆتایی دەسەڵاتی بابانەکان/ نووسین: جەمال بابان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ (دار الحریە)، ش: بەغدا، س: ١٩٩٢: سنووری شاری سلێمانی لەسەردەمی بابانەکان و شوێنە دێرینەکان/ سلێمانی و کووژانەوەی چرای بابانەکان و شەڕەکەی عەزیز بەگ لە قەسیدەکەی سالمدا/ ئەنجامی ئەم قەسیدەیەی سالم/ سالم وەڵامی نالی ئەداتەوە/ زانست و ڕۆشنبیری لەسەردەمی بابانەکاندا.

١٢. کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی/ نووسین: عەبدولڕەزاق بیمار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ (دار الحریە)، بەغدا، ١٩٩٢: بەشی یەکەم : کێش و مۆسیقای هەڵبەست/ بەشی دووەم: کێشەکانی عەرووز- نموونە و لێکۆڵینەوەیان/ هەزەج/ هەزەجی شەشی سالم...

١٣. کەشکۆڵی حاجی مەحموودی یاروەیس/ نووسین: عوسمان محەممەد هەورامی، چاپ: یەکەم، چ (بابان)، سلێمانی، ١٩٩٨، هەندێک بابەتی وەک: سالم.

١٤. میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا/ نووسین: نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان، چاپ: یەکەم، چ: (؟)، ش: بەرلین- ئەڵمانیا، س: ١٩٩٨: سالم- قارەمانی وشەی کوردی.

١٥. میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا/ نووسین: نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپ: دووەم، چ (خاک)، ش: سلێمانی، س: ١٩٩٨: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ١٤.

١٦. بارانی سلێمانی- بەرهەمی بڵاونەکراوە و لەیادکراوی محەمەد ساڵح دیلان/ نووسین: ئومێد ئاشنا، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ (وەزارەتی پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠١: بەشی دووەم: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی/ بواری شیعر/ سالم.

١٧. ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی- لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی/ نووسین: عەزیز گەردی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ (دێکان)، سلێمانی، ٢٠٠٣: سالم.

تێبینی: بۆ وردەکاری ئەم کتێبە بڕوانە ڕۆڤاری تایبەت بە (مستەفا بەگی کوردی)ی شاعیر.

١٨. پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی



کوردیدا تا جەنگی گێتی یەکەم/ نووسین: عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی/ لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ (وەزارەتی پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠٣: بەشی سێیەم: ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم: سالم.

١٩. مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم/ نووسین: د. مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ (وەزارەتی پەروەردە)، هەولێر، ٢٠٠٣: بەشی یەکەم: نەخشەی جوگرافی کوردستانی باشوور و میرنشینی بابان/ بەشی دووەم: ژیانی ئابووری- کۆمەڵایەتی- ڕۆشنبیری- خوێندەواری میرنشین/ بەشی سێیەم: بزووتنەوەی سۆفیزم لە میرنشینی باباندا/ بەشی چوارەم: ڕێنیسانسی شیعری کوردی لە باشووری کوردستاندا/ بەشی دەیەم: ناوەڕۆکی شیعری سالم/ وەسف و دڵداری/ شیعری کۆمەڵایەتی/ شیعری شین و شەپۆڕ و ماتەم/ بەشی یازدەیەم: شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی سالم/ جەنگی ڕووخانی میرنیشین و داگیرکردنی سلێمانی/ شێری میرنشین عەزیز بەگی بابان/ سالم بە شیعر وەڵامی نالی دەداتەوە.

٢٠. یاقووت و زمرووتی کوردیی- ئایین و فەلسەفە (بەرگی دووەم)/ نووسین: حسێن محەممەد عەزیز، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٤: هەوێنی هۆنراوەی کوردی/ ئایین و فەلسەفە/ کۆمەڵێک شاعیری کورد: سالم.

٢١. سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ- سێیەم بەرگ- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی/ نووسین: محەممەد ئەمین زەکی بەگ/ ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپ: دووەم، چ (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٥: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ١.

٢٢. پایەی وەفایی لەناو شاعیرانی سەدەی نۆزدەهەمی کرمانجی خوارووداا/ نووسین: مستەفا سەید مینە مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن، چاپ: یەکەم، چ (؟)، هەولێر، ٢٠٠٦: بەشی یەکەم: بزوتنەوەی شیعری کوردیی کرمانجی خواروو لە سەدەی نۆزدەدا/ سەرهەڵدانی شیعری بابان/ دامەزرێنەرانی قوتابخانەی شیعری بابان/ سالم ١٨٠٥- ١٨٦٩/ بڵاوبوونەوەی قوتابخانەی شیعری بابان.

٢٣. گەڕان بەدوای ماناکانی شیعردا- خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەک لە شیعری کوردی/ نووسین: عەتا قەرەداغی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ (حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٦: لاواندنەوەی تەرمی ڕووخاوی میرنشین یان بەرهەم هێنانی گوتاری نەتەوەیی لە شیعری (لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم...)ی سالمدا.

٢٤. شاری سلێمانی ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠- ١٩٢٠/ نووسین: مامۆستا جەعفەر، لە بڵاوکراوەکانی (پەنجاهەمین ساڵیادی کۆچی دوایی یەکەم مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید+ بنکەی ژین)، چاپ: دووەم، چ (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٦: باری ئابووری سلێمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٩دا/ وێنەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە شیعرێکی سالمدا.

تێبینی: تاکو ئێستا چاپی یەکەمی ئەم کتێبەم بۆ ساغ نەکراوەتەوە؟ دەکرێ چاپی یەکەمی بەناوی (پێکهاتنی چوارچێوەی ئابووری و سیاسی چینی بۆرجوازی لە شاری سلێمانیدا ١٨٢٠-١٩٢٠، لە بڵاوکراوەکانی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیری مەڵبەندی ڕێکخستن «ی.ن.ک»، چاپ: یەکەم، چ (؟)، سلێمانی، ٢٠٠٣) بڵاو بووبێتەوە کە لەویاندا —وەک ناونیشان- ناوی (سالم) نەهاتووە.

٢٥. یاداشتنامەی ژیانم/ نووسین: جەمال بابان، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ (ڕوون)، سلێمانی، ٢٠٠٧: سێ کوچکەی نالی و سالم و کوردی.

٢٦. ئەلبوومی کەشکۆڵ- بەرگی یەکەم/ نووسین: محەممەد عەلی قەرەداغی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپ: یەکەم، چ (خانی)، دهۆک، ٢٠٠٨: پێشەکی/ کەشکۆڵ چییە؟/ بەیاز چییە؟/ هەندێک کەشکۆڵی وەک: سالم.

٢٧. نالی هەر لە لوتکەدایە- بەرهەمەکانی دیداری حەزرەتی نالی کە لە ڕۆژانی ١-٣/٧/٢٠٠٦ لەلایەن سەنتەری ڕووناکبیری ئێلبەگی جافەوە ڕێکخرا/ ئامادەکردنی: م. عەلی، لە بڵاوکراوەکانی (گۆڤاری کۆچ)، چاپ: یەکەم، چ (حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٩: دوو چامەکەی نالی و سالم- دوو نامە یاخود دوو چامەی شیعرییە: د. عیزەددین مستەفا ڕەسوول.

٢٨. شیعر و ئەدەبیاتی کوردی/ نووسین: ڕەفیق حیلمی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: سێیەم، چ (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠: ئەم کتێبە چاپی سێیەمی هەردوو بەرگی پێشتری کتێبەکەیە کە لە بەرگی دووەمدا باس لە (سالم) کراوە بڕوانە کتێبی ژمارە ٢.

# بوونگەرایی سالم



نەجات حەمید ئەحمەد

هەستی بوونگەرایی لەلای شاعیرێکی کورد، تایبەتمەندێتییەکی دیاریکراوی هەیە، بەوەی ئەو هەستە چ لە ڕووی بنەما هزرییەکان و چ لە ڕووی چۆنێتیی دەربڕین لە خۆکردن و چ لە ڕووی بنەچە کۆمەڵایەتی و فیکرییەکەوەی لە شوێن و ژینگەیەکدا ماناکانی دێنە کایەوە کە دیاری کراوە و دوورە لەو مانایانەی کە لە ژینگەیەکی دیکەدا هاتۆتە بەرهەم، دەمەوێ بڵێم هەستی بوونگەرایی تەنها ئەو هەستانە نین کە کۆمەڵگەیەک تیۆریزەی بۆ کردووە و کردوویەتیە پاشخانێکی فیکری و فەلسەفی، بەڵکو لەو سنوورانە تێپەڕ دەبێ و مرۆڤ لە هەر کوێیەکدا بێت توانای بەرهەمهێنانی مانا و هەستەکانی ئەو بیرەی هەیە و هەر ئەمەش نهێنیی بەردەوامبوونی بیرکردنەوەیە لە لای مرۆڤ بە گشتی. لەم ڕووەشەوە، لەو باوەڕەشدا نیم تەنانەت نووسینی سپیش ئەو بەها دەرەکییانەی ئەودیوی دەق، بایەخ وگرنگییان تێدا نەمێنێو بەڵکو کاریگەرییەکی ئایدیۆلۆژیی فیکریشیان بە سەر بیرکردنەوەی مرۆڤدا نەبێت.

بە لایەنی سالمەوە، ئەو هەستە لەسەر چەند تێڕوانینێکی جیاواز دا دابەش دەبێت، واتە تێڕوانین بۆ دنیا و بۆ مرۆڤ و لە پاشاندا بۆ خۆی، ئێمە لێرەدا دەکەوینە دوای شیکردنەوەی ئەو تێڕوانینە چەسپاوانەی کە لە لای سالمدا بنەچەیەکی قەدەری و شوێنگەیی و کۆمەڵایەتی و مێژوویيان هەیە، ئەمە پەیوەست نییە بە ڕووە ئایدیۆلۆژییەکەی بیرکردنەوە و هەستی بوونگەرایی سالم، بەڵکو ئەمە پەیوەستە

به بەهای شوێن وپەیوەستەکانی مرۆڤ بە دەرەوەی خۆی و هەروەها بە خودی خۆیەوە، لە پاشاندا ڕەنگدانەوەی هەموو ئەمانە لە زمانێکی شیعریدا، ئەم تێڕوانینانەی ئەویش بۆ ئەم بوونە جیاوازانە، تێڕوانینێکن کە ڕەگیان لە بوون و بیرکردنەوە و بۆچوونی ئەودا هەیە کە گرنگترین سیماکانی ئەو تێڕوانینانە لەم خاڵانەی خوارەوە کۆ دەکەینەوە و لە پاشاندا شیکردنەوەیان بۆ دەکەین:

١- بوونی مرۆڤ لەوشوێنەی کە هەیە، لەو زەمەنەی کە تیایدا دەژی، دەکەوێتە بەردەم دووڕیانێکی جیاواز و دژ بە یەکەوە، ڕێگەیەک کە دەکەوێتە دەرەوەی کێشەکانی جوانی و چێژ و هەستکردن بەوانی دییەوە، واتە هەموو هەستێک کە دابڕاوە لە بیری بە کێشە بوونی مرۆڤەوە و تەنها کاری بە کاردانەوە غەریزی و بێشکەییەکانی مرۆڤەوە هەیە، لەوێدا چەمکی چێژ و بە مرۆڤ بوون و هەستە کێشەدارەکانی مرۆڤ، بایەخێکی ئەوتۆیان نامێنێ، ئەوەی گرنگە چێژ وەرگرتنە لە هەموو ئەو مانایانەی کە تۆ شوێن و ناسنامەیەکت تێیدا نییە و پەیوەستدار نیت، بە پەیوەستداربوون و نەبوونی مرۆڤەوە، ئیتر ئەوەی حوکم دەکات تەنها غەریزە و هەستە بێشکەییەکانی مرۆڤە و بیرکردنەوە خۆی لە خۆیدا بەهای نامێنێ، لەوێدا چارەنووس وەکو هەژموونێکی بێ کێشە و بێ بەربەست دەبێت، بەڵکو هەمیشە مرۆڤەکان لەگەڵ دۆخی ژیانیاندا دەگونجێنی،

بەڵام مرۆڤی کێشەدار، واتە مرۆڤێک کە لە هەست و غەریزە ڕەمەکییەکانی ئازاد دەبێت، ئیتر خودی خۆی بەرەو ڕووی پرسیارەکان دەکاتەوە و تەنانەت پرسیار لە بوون و نەبوونی خۆشی دەکات و دەیەوێت شیکردنەوە بگەیەنێتە ئەو دیوی واقیعەوە، ئیتر ئەو مرۆڤە چێژەکانی لە واقیعێکی هەژموونگەرایی چارەنووسدا نابینێتەوە، بەڵکو گەورەترین بیرکردنەوەکان و هەستەکانی بەرەو ڕووی واقیع دەکاتەوە، لێرەوە بوونگەرایی ئەو مرۆڤە، گەیشتنە بە تێگەیشتنە ئاستەمدارەکانی بوون، کاتێک بوون دەبێتە ئەو بەردەی سیزیف کە تۆ لە سەرەتاوە هەست بە گەڕانەوەی دەکەی، کەواتە هەڵگرتنەوەی بەردەکە بەرەو سەرەوەی چیا مانای چیە؟ لێرەدا سالم بە دوای مانا قەدەریەکانی هەستی بوونگەرایی خۆیدا دەگەڕێت.

٢- چوونە نێو دنیای کێشەکانی بوونەوە، هەڵبژاردنە لە نێوان ئەو دوو دنیایەی کە هەموو مەرجە بوونگەرایی ومرۆیی و کۆمەڵایەتییەکانی تێدایە، بەوەی ئاخۆ مرۆڤ چێژ و خۆشیەکانی بوونی خۆی و بیرکردنەوە و هەستی خۆی لە کام ڕێگادا دەبینێتەوە؟ هەستکردن بە کێشە و ئامادەبوونەکانی خۆی لەوەی هەیە و لەوەی ڕوودەدا، لە کوێی ئەو هەڵبژاردنانەدا دەبینێتەوە؟ سالم لەوێدا بانگەشەیەکی قووڵی تراژیدیای بوون لە هەستە نەهلەستییەکانیدا دەکات و بە ڕاشکاوی چێژ و هەڵبژاردنەکانی خۆی بەیان دەکات، بەڵام لە سەر چ بناغەیەکی بیر و چ فەلسەفەیەک کە توانای لە خۆگرتنی ئەم هەستانەی ئەوی تێدا بێت؟

٣- ئاخۆ هەستکردن بە شکستییەکانی خود لە بووندا کۆتایی ماناکانە، یاخود کراوەیە بە ڕووی هەژموون و دەستە باڵاییەک کە توانای دەستەمۆکردنی خودی هەیە و لە بیرکردنەوە و دنیا بینیدا سنووردار دەکرێت؟ ئاخۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دنیای گونجاندن و تەبایی و بێ کێشەیی، مرۆڤ دەگەیەنێتە کوێ؟ یاخیبوون لەو جیهانە بە تێگەیشتن لێی، مرۆڤ بەرەو کوێ دەبات؟

٤- کەوتنە کێشەوە لەگەڵ قەدەریەت هەستێکی قووڵی لە دواوەیە، لە بەر ئەوەی قەدەریەت دەشێ لەلای شاعیر ئەو هێزە بوونگەراییە سەرەوەییە بێت کە بۆ مرۆڤ دیاریکراوە بەبێ ئەوەی بتوانێ لە ڕێگەی گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوە و سەروکار و کاردانەوە لێی دەربازی بێت، بەمەش قەدەریەت ئەو هێزەی بوونە کە هاوشانی مرۆڤەکان کاریگەریی خۆی جێ دێڵێ و چیتر هەڵبژاردنێکی دیکە نایاتە بەردەم مرۆڤ کە توانای گۆڕینی ئاراستەکەی هەبێت.

ئەمانە گرنگترین تەوەرەکانی خوێندنەوەی ئەو هەستە نەهلیستییە شکست پێهێنەرەیە لە لای سالم کە هەوڵ دەدەین تێڕوانین و بۆچوونەکانی ئەو بخەینە بەر شیکردنەوە و قسە لە سەرکردن و بۆ ئەمەش هەریەک لەو خاڵانە دەکەینە ناونیشانێکی بابەتی و زمانەوانی :

## ١- کێشەی دابڕان لە واقیع و شکست لە هەڵبژاردندا

ئەو هەست و دیدانەی کە سالم هەیانی بووە بۆ واقیعی مرۆڤ لە شوێنی خۆیدا هەستێکن پڕن لە ساتی کەوتنە کێشەوە، کە زۆرترین گۆشەکانی ژیان و ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی قەتاو قەت نەگونجاون لەگەڵ ئەوەی بیری لێ دەکاتەوە و ئەوەی لە ناخەوە هیوای بۆ دەخوازێ، هەمیشەش سالم دەربڕینی لەو ساتانە کردووە کە تیایدا مرۆڤ دەکەوێتە ناو شکستییەکانی خودی خۆیەوە، لێرەدا، مەبەستمان تەنها شکستی هێنان و نائومێدییەکی ڕەش نییە کە

سالم وای بینیوه که ئەو هەمیشه لەو کێشانەدا ژیاوه و ئەو کێشانەش تاکو دوا تەمەنی بەردەوام دەسته باڵاییەکیان نواندووه، بەڵکو ئەوەی به لامانەوه گرنگه هەڵبژاردنەکانی ئەون بۆ دەرەوەی خۆی وچۆنێتی تێگەیشتنی له واقیع.

باوەڕبوون بەوەی جۆرێک له مرۆڤ له نێو هەموو مرۆڤەکانی دیکه هەڵبژاردنێکی له بەردەمه و ئەو هەڵبژاردنەش نایکاته مرۆڤێکی بەختەوەر و هەموو شکستیەکان کاتێک پەیوەست دەبن بەو هەڵبژاردنەوە، ئەو شوێن و زەمەن و مانا گەورەیەیه که سالم پێی دەگات وگەیشتنێک و ڕاگوزاریەکی بوونگەرایی دەنوێنێ له دیدگا و ژیان و چۆنێتیی ژیاندا، سالم پێی وایه که مرۆڤ کاتێک دەچێته ناو ژیانی عەشقەوە، کاتێک هونەر و عاشقبوون دەبنه هەڵبژاردنی مرۆڤ، ئیتر دیوارێک له نێوان ئەو مرۆڤه و کەسەکان و هەموو ئەو مانا و ئەو ژیانەدا دروست دەبێت، ئەو دیوارەی مرۆڤەکان دەکاته دوو جۆر له مرۆڤەوە، مرۆڤێک که گەیشتن به کامەرانییه جۆربەجۆرەکانی واقیع له چێژی جەستەیی و خۆراک وجل و ئاسته کۆمەڵایەتیەکان که مرۆڤ دەکەنه مرۆڤێکی واقیعی و له ناو کۆمەڵگەکەیدا دەیهێڵنەوە، مرۆڤێک سازش دەکا و خۆی له پرسیار و به دواداچوونی خودی دەرباز دەکات، مرۆڤێک لەو باوەڕەدایه مرۆڤ توانای ئەوەی تێدایه که هەمیشه کامەران بێ و به کامەرانی بژێت وکامەرانیەکانی خۆی له هەموو ئەو بوونه واقیعییەدا ببینێتەوە، بەڵام بەرامبەر بەم مرۆڤه مرۆڤگەلێکی کەم هەن، که به تەواوی لەگەڵ خۆیان ودەرور و بەریاندا له کێشەدان و ئەو کێشانەش جۆرێک له بیرکردنەوە و جۆرێک له تێگەیشتن دەنوێنن، بەڵام ئەم مرۆڤه به لایەنی سالمەوە کێیه؟

**١- ئەزانی باغی بەختی ئەهلی دڵ بۆ قەت سەمەر نادا**
**فەلەك هەرگیز مورادی مەردومی ساحێب هونەر نادا**
**٢- ئەزانم تۆ له شیشەی دیدەما بی ئەشك ئالوودەم**
**شەرابی حوب له جاما ڕەونەقی خوێنی جگەر نادا**
**٣- نەکەن تا لەت لەتم بوسەی نیهانت ڕاستی نالێم**
**بەڵا قەف قەف هەتا نەی نەیبڕی حاسڵ شەکەر نادا**
**٤- ئێسته بۆ مەلاحی دەریای عیشق و ئەهلی مەعریفەت**
**قەتره قەتره ئەشکی چاوم قیمەتی لوء لوء ئەکا**
**٥- غەم له دڵ بۆ فەوتی شادی مەیلی سەرخۆشی ئەکا**
**سوبحی عیشقە شەمعی عەقڵم ڕوو له خامۆشی ئەکا**
**٦- چەند ڕۆژێ بوو له دەست جەوری فەلەك ئاسوودە بووم**
**بۆ موسیبەت باری به سەرما کەیدی گەردوون هاتەوە؟**

مرۆڤی ساحێب هونەر، مرۆڤێکی کێشەداره لەگەڵ بووندا، ئەو مرۆڤه سەر ئاو کەوتووەیه که هەر جاره و له کەنارێکی ژیان و له شوێنێکی نەویستراو و، له زەمەنێکی نەویستراودا ئامادەیه، مرۆڤی هونەروەر مرۆڤێکه خاوەن کێشەیەکی بوونخوازیی ڕەگ داکوتاوه که کێشەکانی ئەو پەیوەستن به کێشەیەکی خودییەوە، بەڵام هونەروەری تەنها پیشەیەک، یا هۆکارێک نییه بۆ بیرکردنەوە ئەگەر بێتو ئەو مرۆڤه بەر چەپۆکی عیشق نەکەوتبێت، عاشقبوون بەو مانا سۆفیگەره جیاکراوەیەی که ئەو وەکو مرۆڤێک له بووندایه و هەست بەوە دەکات جۆرێک له ژیان لێره له سەر ئەم زەوییەدا هەیه، به ئاراستەیەکی هەژموونگەرایی بەهێزدا گوزەر دەکات و هەموو دەور و چۆنێتیەکانی ژیان وماناکانی دیاری دەکات، لێرەوە مرۆڤێک که دەکەوێته پرسیارەوە لەگەڵ ئەو ئاراستەیەدا بەبێ ئەوەی هەڵبژاردنی دیکەی هەبێت بەرەو ڕووی کۆی ماناکانی ئەو ژیانه دەبێتەوە، به جۆرێک له ناخی ئەو مرۆڤەدا گەیشتن به ڕاستیەکانی بوون، پەرده هەڵماڵینه لەسەر ئەو نهێنی و ئەو سیستەمه بوونگەراییه گێرەشێوێنەی که ئاراستەیەکی چەسپاوی ژیان بەرەو ڕووی مرۆڤ دەکاتەوە، سالم لەو بەیتەدا دەیەوێ پێمان بڵێ که کەسانێکی دیاریکراو هەن که ئەو به ئەهلی دڵ جیایان دەکاتەوە ساحێب هونەرن، ساحێب تێڕوانین و بینینی خۆیانن، ئەوان ناتوانن چێژ له ژیانێک وەرگرن که زۆرینەیەکی بەختەوەر له ژیاندا چێژی لێ دەبینن، ئەمه ڕەهایی بوونێکی ساتی هەستکردنه به شکستی، که ئەوانەی ئەهلی دڵن و ساحێب هونەرن، کەسانێکن ژیانیان تێکەڵ به کێشه بووه، ژیانیان ژاراوی بووه و تووشی کرمێ بوون بووه، که ئیتر ئەوان بڕیاریان داوه هەر له سەرەتاوه ئەو جۆره ژیانەی که هەڵیان بژاردووه و چێژی لێ دەبینن، بیپارێزن و داکۆکی له ماناکانی بکەن، چونکه ئەهلی دڵ ئەوانەن که ناتوانن چێژ له خۆشیەکان ببینن، ئەگەر ئەو خۆشییه بەشێک نەبێت له هەستیارییه خودی و مرۆییه دیاریکراوەکان و هەر ساتێک که بیانەوێ چێژی لێ ببینن، دەبینن خوێنی زامێک له جەستەیان چڕه دەکات، چونکه ئەو خۆشیانه له بیرکردنەوەی ئەوان داماڵدراون له ماناکان، دابڕاون له هەموو ساتێک که بتوانن تیایدا هەست به ئارامی وحەسانەوەیەکی دەروونی بکەن، لێرەوه گەیشتن بەو ئارامییه، گەیشتنه به ئازارێکی خوێناوی، بەڵام مرۆڤ چۆن بەیانی کامەرانی و خۆشی و خەمەکانی خۆی دەکات؟

سالم



لە زۆرینەی شیعرەکانی سالمدا خۆشیەکانی مرۆڤ کاتین و بە سەردەچن، باوەڕێک بۆچوونێکی خودیانە بە سالم دەڵێ کە ئەو ڕۆژگار و ساتانەی دەگاتە کامەرانی بە زوویی بە سەر دەچن، چونکە هەموو خۆشی و کامەرانییەک لە دوای ئـازارەوە دێ و دواجاریش ئەوەی دەمێنێتەوە، تەنها لە دەستدانی ئەو باوەڕەیە کە وای دەبینێت لە توانای ژیاندایە کامەرانییەکی بەردەوام بە مرۆڤ ببەخشێت، هەروەک لە بەیتی سێیەمدا دەیخوێنینەوە، لەو باوەڕەدایە نەی کە مەبەستی لێی قامیشی شەکرە، تاکو قەف قەف نەیبڕی شەکەر نـادات، تێگەیشتنێکی لەم جۆرە، تێگەیشتنێکی کۆتایی پێ نەهاتووی بەردەوامە بەوەی مرۆڤی هونەروەر و کامەرانیەکانی وابەستەی ئـازار کـراون، هـەروەک لە بەیتی شەشەمدا باس لەوە دەکات کامەرانیەکانی ئەو کاتین و بەردەوام نابن، چونکە لە پشتەوەی ئەو کامەرانییە هەمیشە بەدبەختی و شوومی دێتەوە، هەمیشە بە کاتی بوونی ساتە کامەرانەکان پەیوەندییان بە هەڵبژاردنەکانی مرۆڤەوە هەیە، ئەو هەڵبژاردنەش هەڵبژاردنی هونەر و عاشقبوونە، بۆچی ئەم چارەنووسە هەمیشە لە ڕێی ئەو جۆرە مرۆڤانەدایە؟

ئەو جۆرە مرۆڤانە ناتوانن قوربانی بە بیرکردنەوە و هەڵبژاردنی خۆیان بدەن لە نێو کۆمەڵگە و لە ژیاندا، چونکە لای ئەوان ماناکانی ئەو ڕێگەیە ئەو کامەرانییە هەمیشەییە دەدەنە مرۆڤ کە چێژێکی زۆر جیاوازی لێ وەردەگرن، بەڵام با بزانین بۆچی کامەرانییەکانی مرۆڤی هونەرمەند و عاشق بەو جۆرەیە، ئەو هێزە بوونگەرایی مرۆییە چییە لە پشتەوەی ئەو جۆرە چارەنووسەوە؟

کـەواتـە هەڵبژاردنی مـرۆڤ بە لایەنی سالمەوە، لەوپەڕی ئـازادبـوون وکۆیلەبوون ودەستەپاچەیی بووندا، تەنها یەک مانا بەرهەم دێنن، کە ئەویش ئەوەیە مرۆڤ و کێشەکانی لەگەڵ واقیعدا جۆری ژیان و هەستەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن، وەکو ئەو مرۆڤانەی کە کێشەدار بوونە بە عەشق و هونەرەوە، چونکە بە لایەنی ئەوەوە دنیایەک هەیە لە واقیعدا کە بە ئاراستەیەکی دیاری کراودا دەڕوا کە لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا ناگونجێ کە ئەو بە ئەهلی دڵ ناویان دەبات، ئەمەش شکستییەکانی تاکی کێشەدارە لە واقیعدا.

## ٢-شکستی ئامادەبوون لە واقیع و هەژموونی داسەپاندن

ساتی ئامادەبوونی شاعیر لە واقیعی ئەم بوونەدا، ساتێکی هەژموونگەرای بەردەوامە و ئەو هەژموونگەرییە بوونگەراییەش گۆڕانی بە سەردا نایا و هەموو کاتێک مرۆڤ دەخاتە بەردەم ماناکانی خۆیەوە کە گەورەترین ماناش باوەڕبوونە بەوەی درێژبوونەوەیەکی ژیان هەیە کە وەکو پێچکەیەکی پۆڵایین وایە و هەر دەڕوا و وەستانی بۆ نییە، باوەڕبوون بەوەی چارەنووسێک هـەیـە کـە مرۆڤێک لـە سـەرەتـای ژیـانـیـەوە تاکو ساتی نووسینی شیعر و ئێستای ژیان بەردەوامە و ئەودەخاتە دەرەوەی دنیای خۆیەوە، بەوەی دەیکاتە بەشێکی پەراوێزکراو لە بوونی خۆی کە، پێچەوانە و نەگونجاوە لەگەڵ ئەو باوەڕانەی کە ژیان دەکەنە ئامادەبوونێکی کاتی لە پێناوی ژیانێکی هەمیشەییدا، هەروەها پێچەوانەشە لەگەڵ ئەو دیدگا گەشبینانەی کە هەموو کامەرانی و سەرکەوتنەکانی مرۆڤ بە خودی مرۆڤەوە دەبەستنەوە، بەڵکو پێچەوانەشە لەگەڵ ئەو بۆچوونە فیکرییانەی کە وای دەبینن مرۆڤ لە ژیانێکی کاتیدایە و دەبێ لە هەموو ساتەکانی ئەو ژیانەدا کامەران بێت، سەرەتا با ئەم بەیتانە بخوێنینەوە:

**١ - کەس نەبێ سالم لە دنیادا وەکو تۆ تووشە دەرد**
**بێ نەوا کەوتوومە غوربەت ناتوان و ڕەنگ زەرد**
**٢- لێم گەڕێن با گریەکەم دیدەم دیدەی خونفشان**
**نایەڵێ یەکدەم بە ڕاحەت ڕابوێرم ئاسمان**
**٣- خەمیری خاکی من ئەوەل بە بارانی فەرەح نەکرا**
**جوانی و پیری و توفلیم سەراسەر جوملەگی غەم بوو**
**٤- زەمانە قەت لەگەڵ ئەولادی ئادەم با وەفا نابی**
**وەکو گوربەی سیە ئەسلەن بە مەردوم ئاشنا نابی**
**٥- دووسەد جار وەزعی چەرخی ئاسمان گۆڕا بە سەعدوشوم**
**ستارەی نەحسی سالم بۆ لە قەرنێکا نەبو ئاوا**

چەمکەکانی وەکو ( دونیا، غوربەت، ئاسمان، زەمانە، ستارە، نەحس،..هتد) ئەو دەستە باڵاییەی هێزی بوونن کە توانای دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤیان هەیە، هەروەکو چۆن بایەخێکی هێما گەریان هەیە بۆ ئەو هێزەی کە چارەنووسی مرۆڤ دیاری دەکا، هەروەکو وشەی ئاسمان، بەڵام با بە دوای بەهای ئەو وشانەدا بگەڕێین لە لای شاعیر. تەنیایی بوون لە دنیادا ونمایشکردنی خۆی وەکو کەسێک کە نموونەی نییە تەنها لەو تێڕوانینەدایە کە ئەو کەسێکە بەوانی دیکە ناکات و لەگەڵ دنیادا لە کێشەدایە، کێشەی ئەو ئەوەیە دنیایەک هەیە کە تیایدا دەژێت ناتوانێت تیایدا کامەران بێت، و ناتوانێت بیگۆڕێت، ئەم نائومێدییە لە دەرەوەی ئیرادە و دەسەڵاتی ئەودایە و جۆرێک لە

خۆدانەوە دەستەوە و شکستی هێنان لە ژیان، لە ناخیدا ڕەگ دادەکوتێ، کاتێک مەسەلەکە پەیوەست دەبێ بەو هێزەی کە بە ئاسمان ناوی دەبات یا پەیوەست دەبێت بە وشەی زەمانەوە، ئەو نائومێدی و شکستییە دەبێتە ئەو چارەنووسە نەگۆڕەی کە ئەم جۆرە ژیانە دەسەپێنێتە سەری و ئەویش توانای بەرامبەر بەم چارەنووسە سنوور دارە، هەروەک لە بەیتی دووەمدا باس لەو چارەنووسەی خۆی دەکات، ئەمە باوەڕێکە بناغەکەی لە سەر ئەوە داکوتاوە کە کامەرانی و هەڵبژاردنی مرۆڤ هەوڵێکی بێ هودەیە، چونکە هێزێکی گەورەتر لە مرۆڤ کە ئەو ناوی جیاجیای بۆ داناوە بە شێوەیەکی بە تواناوە بە هێزەوە ئاراستەی ژیانی کەسەکان لە دەرەوەی کەسەکانەوە دیاری دەکات، لەوێدا مرۆڤ بزرە، کۆمەڵگە و دەسەڵات و کەس بزرن، ئەوەی هەیە دەسەڵاتێکی هەژموونگەرا لە بووندا هەیە و هەر ئەویشە بەرپرسی ئەو چارەنووسە زانراو و پێشینەیە کە بەرەو ناخۆشی و نائومێدی و نیگەرانییە قووڵەکانی دەبات.

لە هەرسێ بەیتی سێیەم و چوارەم و پێنجەمدا دەگاتە ئەوەی کە بڵێ مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە شێوازی ژیانی دیاریکراوە، ئەو مرۆڤەی کە هەر لە ڕۆژی لە دایکبوونیەوە دەبێ بەرەو ڕووی واقیعێکی تاڵی ژیانی خۆی بێتەوە، ئەم جۆرە چەسپاوییە لە ژیان و بیرکردنەوەدا گەیشتنە بەو تێگەیشتنە لە دنیا کە شوێنی ئەوەی تێدا نەماوەتەوە کە مرۆڤ پێشبینیی ئەوە بکات ئەو گۆڕانکارییانەی لە لایاندا هەن ڕەنگاو ڕەنگن وبە لایەنی ئەوەوە بە هەمان بار دەبێت، دنیا کە مانای کۆی ژیان و ساڵان و زەمەنی جیاجیای ئەو دەگرێتەوە بە یەک ئاراستە دەڕوات، چارەنووس وەکو ئەوەی لە دەرەوەی ئیرادە و دەسەڵات و توانای بیرکردنەوە و خودێتیی کەسەکان بێت و ئەو جۆرە ژیانە بە سەر کەسەکاندا دەچەسپێنێ، ئەمە ناوەڕۆکی



Amang Mardokhy



بیرێکە زیاتر نزیکە لە بیری بوونی مرۆڤێکی ئاراستە کراو، واتە ئەو مرۆڤەی کە ژیانی لە بوونی خۆی جیا دەبێتەوە، بەمەش هێڵێکی دابڕانی قووڵ لە نێوان ئەو و واقیعدا دروست دەبێت کە واقیعی زۆرینەیەکی کۆمەڵایەتییە، سالم باس لە کەسی دەگمەن و کەم نموونە دەکات ئەوانە کەسانی زۆر دیاریکراون، ژیانیان ئەگەرچی پەیوەستە بە هەڵبژاردنی خۆیەوە، بەڵام کاتێک ئەو هەڵبژاردنە دەکەوێتە پێش ساتی هوشیاری و پێگەیینی بیرکردنەوەوە، ئەوا سیما و سیفەتێکی نەگۆڕ و چەسپاو، کە تەنها بە لایەنی ئەوەوە، تەنها بە لایەنی خودی ئەوەوە، دنیا بە هەزاران دەور دەگۆڕێ بە سەعد و شووم بەڵام بە لایەنی ئەوەوە نەگۆڕە.

## لەم پێشەکییەوە چیمان بۆ دەردەکەوێ؟

وابەستەبوونی ژیانی سالم لە زۆر لایەنەوە بە سەردەم و گۆڕانکارییە سیاسی وسوپاییەکانی سەردەمی خۆی، تێڕوانین وبۆچوونی ئەو بۆ دەوروبەری خۆی، کۆی ئەم کاریگەرییانەی دەرەوەی دەق وەکو دەقێکی شیعری، جۆرێک لە هاتنە گۆی دیاریکراو، واتە بەرهەمهێنانی جۆرێک لە زمانی دیاریکراو دەخاتە شیعری سالمەوە، کە هەر لەو کاتەوەی بە ژیانی خۆیەوە پەیوەست دەبێت ئەو زمانە لەوێدا دەڵەمەند دەبێت کە دەرکەوتەیەکی فیکری و فەلسەفیی دەبێت، هەر کاتێکیش بەرکەوتەیەکی ئایدیۆلۆژی و واقیعی دەخاتە دەقەوە، ئەو زمانە دەبێتە زمانێکی سەنعەت کار.

گەڕانی سالم بە ماناکانی ئەو جیهانبینییەی خۆی تەنها لەو ساتانەدا شیعریەت بەرهەم دێنێ کە دەکەوێتە نێو کێشە بوونگەراییەکانی خودی خۆیەوە وەکو ئامادەبوونێک لە سەردەمێکدا، شیعری کلاسیکی کوردی هەمیشە ڕەنگدانەوەیەکی ژیان و ڕووداوەکانی ژیان بووە بە ڕێژەی جیا جیا لە لای هەر یەکێکیاندا. ئەوەی مەبەستمانە بیڵێین واقیع بۆی هەیە کاریگەریی لە سەر بیرکردنەوەی شاعیردا هەبێت، بەڵام تەنها لەو سنوورەی واقیع زاڵ نەبێت بە سەر زمانی شیعرەوە، بەڵکو زمانی شیعر ئەو دەوڵەمەندی وتوانایەی دەربڕین لە خۆ کردنی تێدا بێت کە شیعریەت بخاتە زمانەوە، زمانی شیعری لەگەڵ هەموو مانایەک دەڕوات، خۆی لە هەموو مانایەک دەدات، بەڵام نابێتە تۆماری ڕووداو و هەڵوێستە ئایدیۆلۆژی وکۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، بە لایەنی سالمەوە ئامادەبوون لەو واقیعە ئامادەبوونە لە شکستیە خودیەکان، چونکە واقیع کاتێک ماناکانی خۆی لە چەمکەکانی ئاسمان و زەمان و دونیادا دەبینێتەوە، ئەوا ئەو شکستییە و هەستکردن بەو شکستیانە لە لایدا دەبنە زمانێکی شیعری، بە جۆرێک ئیتر ئەو لە واقیع جیا دەکاتەوە و ئەو هەستەی لە لادا دروست دەبێت کە ئەو تەنها لە یەک ڕووی واقیع و بووندا ئامادەیە و هیچ هاوبەشییەکی لەگەڵ ئەوانی دیدا نامێنێ، ئەوانەی کە زەمان و ئاسمان و دنیا بە جیا جیا و لە سەردەمی جیاجیادا جارێک سەعد و جارێک شوومیان بە سەردا دەچەسپێنێ، ئەم تێڕوانینە بنەچەیەکی بوونگەرایی هەیە لەو کاتەی واقیع ئیتر دەبێتە واقیعێکی داسەپاو کە تاکێک دەخاتە ناو بازنەیەکی دیاریکراوەوە و مرۆڤیش بەرامبەر بەم داسەپاندنە لە هەستکردن بە شکستی زیاتر هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەی لە پێشدا نامێنێ.

## ٣- خودی خۆداوەدەست و خودی یاخیبوو

گەوهەری یاخیبوونی ناخەکیانە و زۆر خودیانەی سالم بەرامبەر بە نائومێدی و ئەو چارەنووسە داسەپاوەی سەر ژیانی زۆر شاراوەیە و دەتوانین بڵێین سالم بێدەنگترین مرۆڤ کە توانای شاردنەوەی ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەی هەیە لەگەڵ دنیادا، واتە لەگەڵ ژیان و بوونی خۆیدا، ئەمەش جگە لەو قەدەریەتەی کە لەگەڵ ژیانیدا بەردەوام بووە، هەروەها لەو تێگەیشتنە دیاری کراوەیەی ئەوەوەیە لە دنیاو ژیانی خۆی، مرۆڤێک کاتێک ئەو هەستەی لە لادا دروست دەبێت کە ژیانێک هەیە و بە پان و پۆڕیی زەمەنی و شوێنگەیی ئەو ناگرێتە خۆی، کە ئەو شوێنی تێدا نادۆزێتەوە، کە ئەو لەو باوەڕەدایە ئەم ڕێچکە زەمەنی و کۆمەڵایەتی و شوێنگەییە هەمیشە یەک ڕوویان نیشانی ئەو دەدەن، لەوێدا ئەم بۆچوونە چەسپاوانە کاتێک دەبنە کۆمەڵە دەلالەتێک لە تێگەیشتنی ئەو لە ژیان، ئێمە بەرەو ئەو پرسیارە دەبات، ژیان بە مانای دنیا، واتە بە مانای ئەو زەمەن و ئەو شوێنانەی مرۆڤیان تێدا دەژێ، دەبێ ئەو مرۆڤە چۆن بەو ژیانە ڕازی بێ و چ هەڵوێستێکی بەرامبەر ئەم ژیانە هەبێت؟

بۆ زانینی ماناکانی بیرکردنەوە و هەڵوێست و کاردانەوەی ئەو بەرامبەر بە ژیان دەکەوینە دوای وشەی دنیاوە کە لەوێوە دنیا دەبێتە هێمایەک بۆ ژیان و ئەو بوونەی ئەوی تێدایە کە دیارترین سیمای بیری سالم کە کرۆکێکی بوونگەرایی بنوێنێ لەم خاڵانەی خوارەوە چڕیان دەکەینەوە:

٦- سات و شوێنی ئامادەبوونی ئەو لە دنیادا، ساتی لێکجیابوونەوەیەکی هەمیشەییە، ساتێکە کە تراژیدیای گەیشتنی ئەو دەنوێنێ بە ڕاستیەکانی دنیا، دنیا هەم ژیان و هەم چارەنووسە، بەڵام کە ژیان بە هێمای دنیا دێتە تێگەیشتنی ئەوەوە، مانای قورستر لە ژیان لە خۆ دەگرێ، کە هەردوو ساتی وەرگرتن و خۆدانە دەستەوە و یاخیبوونێکی ناخەکیانە لە خۆ دەگرێ، لە لایەکەوە چاوەڕوانی نەکردنی هیچ ئومێدێک لە دنیا خۆی لە خۆیدا ڕەت کردنەوەی دنیایە وەکو گەوهەر و بوون، ئەم ڕەت کردنەوەیەش ئەو یاخیبوونە بوونگەراییە دەنوێنێ کە لە نێو کۆی شیعرەکانی سالمدا ئامادەیە، با پێکەوە ئەم بەیتانە بخوێنینەوە کە ناوی دنیایان تێدا دەهێنێ:

**وەڵا تالیع نەبێ پوشیدەیە جەوهەر لە ڕووی دنیا**
**بە مەردانی دلاوەر حاسڵ کۆشش جەفا پەیدا**

پۆشیدەبوونی گەوهەری مرۆڤ بەرەو ڕووی دنیا، هەڵگرتنی ئەو مانایانەی ژیان و تێگەیشتنە لە ژیان و لە پاشاندا هەر لەو تێگەیشتنەوە ئیتر ئەو مانایانە دەخاتە بەر ئەزموونی ژیانەوە، پۆشیدەبوونی گەوهەر بە تەواوەتی ڕەت کردنەوەی ئەو ئاراستە و ئەو مانایانەیە کە تاکێک لە ژیانیدا بەرەو ڕوویان دەبێتەوە و دەبێ لەگەڵیاندا ڕابێ و کاریان پێ بکا، لێرەشدا پێناس کردنی مەردانی دلاوەر کە بەرەو ڕووی دنیا بوونەتەوە، کۆششەکەیان تەنها جەفا بەرهەمی ئەوانە، ڕێچکەیەک و ئاراستەیەک دەنوێنێ، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو مرۆڤانەی یا ئەو عاشقانەی کە ئەو بە ئەهلی دڵ و عاشقان وەسفیان دەکات، ئەگەرچی لە پێناوی چاکە و ڕاستیدا تێدەکۆشن، بەڵام خۆیان تەنها گەوهەریان بە خاوێنی و پاکی ڕادەگرن و ئەوان هەوڵ وکۆششیان بۆ خۆیان نیە، ئەمەیە بناغەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دنیایەکدا کە ئەگەری ئەوە هەڵدەگرێ، چاکە و خراپە، خۆشی و ناخۆشی، کامەرانی و خەم لە خۆ بگرێ ودەرفەت بداتە مرۆڤ کە لە هەردووکیاندا بژێت.

٢- دنیا وەکو ژینگە و وەکو شوێنێک بۆ ژیان بەشێک نییە لە بوونێک کە مرۆڤ هیچ دەسەڵات و هیچ هەژموونێکی خودیانە و ئەزموونگەراییانەی تێدا بێ، وەکو ئەوەی هەموو مرۆڤەکان بکەونە نێو بوونێکەوە کە ئەوان دەستیان لە هێنانە کایەوە و بنیات نانی نەبێت، بەمەش دنیا بە مانا بوونگەراییەکەی، پەیوەست بە ئامادەبوونی مرۆڤ تیایدا ئامادەبوونێکی دەستە پاچەیی بوون ونائیرادییە، کە لەم بەیتەی کە دنیا بە بێشکە و مرۆڤ بە کۆرپە دەشوبهێنێ بە گەورە و بچووکەوە ئەوپەڕی ڕۆچوونە بە نێو ئەو واقیعە نەویستراو و ئەو قەدەریەتە زاڵەی کە ناتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، کە ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێ شوێنێک، دنیایەک بۆ خۆی دروست بکات؟

**سەتحی دنیا وەکو گەهواریە بۆ تیفلی بەشەر**
**شیرە خۆری گەرمی تۆن چە سەغیر و چە کەبیر**

بۆچی سالم بەم جۆرە دەڕوانێتە دنیا؟ بۆچی ئەو دنیایە ڕەت دەکاتەوە، تەنانەت وەکو گریمانیش کە مرۆڤ توانای ئەوەی تێدایە بتوانێت دنیایەک بۆ خۆی دروست بکات، هیچ نەبێت دنیایەک کە نموونەی هاوئەزموونی و هاوژیانیی تێدا بێت؟
سالم باوەڕی بەوە نەبووە کە کۆمەڵێک مرۆڤ کە لە شوێنێکدا دەژین لە توانایاندا بێت جیهانێک دروست کەن، کە تاک بە هەموو ئایدیال و بۆچوون و دنیابینی و خولیای خۆیەوە بتوانن تیایدا لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەدا بژێن، چونکە دنیا بە ڕووە نێگەتیڤەکەی کە شوێنێکە بۆ(میحنەت، ئازار، خەم و ناخۆشی و کەدەر...هتد)، لە ناخیدا چەسپاوە و ئەو باوەڕەی لە لادایە کە دنیا واتە ژیان و ئامادەبوون لە شوێن تەنها لە یەک ڕووەوەیە و ئەم چارەنووسەش هیچ گۆڕانێک لە خۆ ناگرێ و سەرچاوەی ناڕەزایی و یاخیبوونی ئەو لە دنیا و شوێنی دنیا دێنێتەوە ناخی خۆیەوە و دەبێتە بەشێک لە بوون و بیرکردنەوەی ئەو، ئەم یەک لا بینینەی دنیا بۆ سالم ئەو نیگەرانییە قووڵەی لە لادا بەرجەستە دەکات، کە بوونی مرۆڤ بوونێکی ئازاد نییە، هەموو ئەوەی هەیە لە ژیان و ئامادەبوون لە شوێندا وابەستەی جۆرێک لە ڕێچکەی نادیار و داسەپاو بووە، هەروەکو ئەوەی تەنانەت خودی مرۆڤەکانیش خودێکی ئازاد نین، ئەوانەی بە جۆرێکی دیاریکراو لە دنیا دەگەن، چونکە ئەوەتانێ دنیا لە ناخیاندا ڕەگی داکوتاوە هەروەک دەڵێ:

**مەنزلی میحنەتی دنیا دڵی بەد ناوی منە.**

ئەو ڕاستییە چەسپاوەی کە لەم بۆچوونانەوە دێنە دەست ئەوە دەگەیێنێ، کە خودی سالم لە ناخەوە خودێکی یاخییە، خودێکە بەرەو ڕووی قەدەریەت دەبێتەوە، کەرەستەکانی یا بناغەکانی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە نەک تەنها ئاراستەی





ژیانێک کراوە لە دەرەوەی ئەو، بەڵکو خودی خۆشی دەگرێتەوە، کە ئەویش دەستێکی هەیە لە خولقاندنی ئەو دنیا نەویستراوە، بەوەی دڵی ئەو دەبێتە شوێنێک بۆ جێنشینی دنیا و ئەو شوێنەش ئەوەندە نەویستراو و ڕەت کراوەیە بە ڕادەیەک بە بەدناوی وەسفی دەکات.

### ٤- تراژیدیای بە تاکبوون و خودی ناهاوبەش

بێگومان سالم لە تێڕوانینی بۆ ژیان و تێگەیشتنی لە دوروبەر، خاوەنی دیدگایەکە کە جۆرێک لە تێگەیشتنی تێدایە لە قەبووڵ کردنێکی ناتەواو و هەڵبژاردنێکی ناتەواو، ئەم ڕازیبوونە بە ئامادەبوون لە ژیاندا، ساتێکی ڕاگوزەرە، بەڵام چێژێکی گەورەی لە پشتەوەیە، چێژی ئەوەی کە مرۆڤ عاشق بێ لە نزیکەوە لە ماناکانی ئەو عاشقی بوونەی خۆیدا بژێت، زۆرینەی هەرە زۆری نائومێدبوونەکانی سالم و ڕەت کردنەوەکانی بۆ ژیان و بوون لەوێوەیە کە ئەو ناتوانێ نە لەگەڵ بیرەکانی یا ماناکانی عاشق بووندا بژێ و نە دەتوانێ ئەو عەشقەی کە بۆ کەسی بەرامبەر هەیەتی بەردەوام بێت، و ئەوەتانێ هەموو ئەو شکستیانەی عەشق لە چەند لایەکی دیاریکراوەوەیە، لە لایەکەوە شکستهێنان لەوەی دنیایەک هەبێت کە مرۆڤ لە ماناکانی عەشقدا بژێت و شوێن و ئامادەبوون لە شوێن ئەو دنیا هەڵبژێردراوەی لێ دەسەننەوە، ئەوەتا هەمیشە دابڕانێکی بەردەوام لە نێو ئەو و ئەوی دیکەدا هەیە، کە لەوانەیە گەورەترین دەرکەوتەی ئەو شکستیانە ئەوەبێ کە مرۆڤێک لە کوشندەترین و بە ئازارترین ساتەکانی خۆیدا بژێت، کاتێک هەست بەوە بکات کە تەنیاییەکی ڕەش و نووتەک ژیانی تەنیوەتەوە، تاریکاییەکی ئەموستەچاو ناخی گرتۆتەوە، هەستکردن بە تەنیایی و نەبوون پێکەوە، بە ئازارترین میحنەتەکانی دنیای سالمە وەکو لەم بەیتانەدا هاتووە کە بە نموونە دەیانهێنیەوە کە نموونەیان گەلێک زۆرە لە شیعرەکانیدا:

**١- عەقیم ئاسا لە زەگ وەستایەوە حەملی نەما ئیتر لە پاش**
**تۆ دایەیی دنیا بە میسلی مادەری عیسا**
**٢- ڕووی دنیا تارە تا شەمعی جەبینی دوورە لێم**
**٣- سامیعە و نوتقم لە تەکلیفاتی دنیا فارغن**
**نیمە بێ تۆ تا لەگەڵ کەس تاقەتی گفت وشنەو**

بە تاک بوون لە لای سالم لە بناغەوە جیابوونەوەیەتی لە کۆی هاوبەشییەکی کۆمەڵایەتیی گشتگیر، لە دووتوێی ژیانێکی دەستەجەمعی و لە پێکهاتنێکی کۆمەڵایەتی، ئێستا دوو ژیان هەیە، ژیانێک کە ڕێچکەیەکی بەردەوامی خۆی هەیە، کە ژمارەیەک لە خەڵکی تیایدا لە ژیانێکی دیاریکراودا هاوبەشن، ئەو مانا و بەهای ئەو مانایانەی ئەوان لە سەری پێکهاتوون فراوانترین بە یەک گەیشتنەوەیان هەیە، بەلایەنی خودی ناهاوبەش و تاک و تەراوە، کەسایەتی لەسەر کۆمەڵێک مانا کە هەر خۆی لە ژیان و ئەزموونی کەسایەتیدا پێیان گەیشتووە، تاک دەبێتە خاوەنی تێڕوانینی خۆی، گەورەترین جیابوونەوە، جیابوونەوە و دوورکەوتنەوەی خودە لەو مانا هاوبەشانە، بە جۆرێک ئەو کەسایەتییە باوەڕ و ئایدیالێکی جیاوازی لە لادا دروست دەبێت کە ئاستەمە هیچ هاوبەشی و پێک گەیشتنەوەیەکی دیاریکراوی هەبێت، لەگەڵ ئەو مانایەی کۆمەڵگەی دەستەجەمعی و پێکهاتنی دەستەجەمعی بەرهەمیانی هێناوە و زۆر جاریش دەگەیەندرێنە ئاستی پیرۆزیی، لەوێدا تەنیا بوون ڕووبەڕووبوونەوە و دوور کەوتنەوە و جیا بوونەوەیە لەو مانا دیاریکراوانەی کۆمەڵگەیەکی خاوەن دنیا بینیی هاوبەش بەرهەمیانی هێناوە. سالم و تەنیایی دوو مانای پێکەوە بەستراون، زۆرینەی هەرە زۆری شیعرەکانی دەربڕین لە دوو گەوهەری کەسایەتیی سالم دەکەن، لە لایەکەوە زۆرینەی شیعرەکانی پێک گەیشتنەوەیان تێدا نییە لەگەڵ ئەو مانا هاوبەشانەی کە پێکهاتن و پەیوەستێکی کۆمەڵایەتی دەنوێنن، لە لایەکی دیکەشەوە زۆرینەی هەرە زۆری شیعرەکانی ساتی دابڕان و تەنیایی ئەو دەنوێنن بە ڕادەیەک ئەو کەسایەتییە کە خۆیەتی لە ناو خۆیدا زۆر جار بە سیفەتی نەشیاو باسی دەکات. ئەمەش مانای وایە بناغەیەک لە بناغە هەرە تراژیدیەکانی بیرکردنەوەی بوونگەرایی هەستی تەنیا بوونە لە گەردوونێکدا کە دنیا تیایدا دەبێتە فریودەرێکی مرۆڤ، کە دەبێتە میحنەت و تۆش هەست بەوە بکەی لەو میحنەتەدا تەنیای.

### لەم بۆچوونانەوە چیمان دێتە دەست؟

لەگەڵ ئەم شیکردنەوانەشدا خوێنەر دەبێ لەوە بگات کە بیری بوونگەرایی لە لای سالم، بیرێک نییە کە بە تەواوی لە ماناکانی گەیشتبێ و تیۆریزەی بۆ بکات، یا وەکو کەرەستەیەکی شیعری پێشوەختە بیری لێ کردبێتەوە، ئەو دەربڕینی لە خودی خۆی و هەست و دنیابینیی خۆی کردووە، ئەم سیمایانەش دەرکەوتەیەکی سروشتیی ئەم جۆرە بیرکردنەوانەی ئەون.

# لاپەڕەیەک لە دیوانی سالم



**محەمەدی مەلا کەریم**

خوالێخۆشبوان، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتیح عەبدولکەریمی کوڕی، لەڕووی چەندین نوسخە، دەستنووس، دیوانی شاعیری ناودار و گەورەی کورد عەبدولڕەحمان بەگی ناسراو بە «سالم»ی ساحێبقڕانیان ساغ کردووەتەوە و لێکیان داوەتەوە، ئێستا کاک محەمەدی کوڕی مەلا کەریمیش خەریکی پێداچوونەوە و داڕشتنەوەیەتی و، بە هیوایە بتوانێ بۆ سەرەتای ساڵی دادێ «٢٠١٤» بیخاتە ژێر چاپ.

وا لێرەدا پارچە شیعرێک لەو دیوانە بەلێکدانەوەکەی مامۆستایانی ناوبراوەوە، بۆ نموونە، دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی رۆڤارو بەهیواین دیوانی ناوبراو لە چەند مانگی سەرەتای ساڵی دادێ بەچاپکراوی بەلێکدانەوەکەیەوە بخوێنینەوە.

له ڕووی تیری موژەی خوونڕیزی مەحبووب
سەراسەر موڵکی دڵ پڕ بوو لە ئاشووب(١)

سوپای بەرگەشتە بوو چاوت لە موژگان
شکاندی غالیبی دلها بە مەغلووب(٢)

بەسەر دڵما حەواڵەی غەمزە تاکەی
دەبێ چی بێ خەراجی موڵکی مەخرووب(٣)

بڵێن: با زوشت ڕوو دیبا نەپۆشن
چ حاصڵ سورمەسا بێ چاوی مەعیووب(٤)

لە ڕووی میهرا بە ئیقدامی عیادەت
ئەگەر مەجرووحی یاد کا یاری مەحجووب(٥)

موژەم با هەم بە ڕشتەی دڵ دەبەستم
دەکێشم ڕەهگوزاری جوملە جارووب(٦)

گەیاندی بۆم صەبا بۆی عەطری گیسوو
وەکو پیراهەنی یووسف بە یەعقووب(٧)

لە حەشریشا سەر و کارم بە عیشقە
ئەگەر دەستم بگاتە دەستی مەگلووب(٨)

لە عیشقا هەر منم هەمدەرسی مەجنوون
لە صەبرا هەر منم ئوستادی ئەییووب(٩)

فەراغەت صەعبە بۆ عاشق لە هیجرا
بە (سالم) زەهرە بێ تۆ ئەکل و مەشرووب

١- موژە: برژانگ. خوونڕیز: خوێنڕێژ. مەحبووب: خۆشەویست، یار.
واتە: وڵاتی دڵ، لەم سەر تا ئەو سەری لە بەرانبەری تیری خوێنڕێژی برژانگی چاوەکانی یاردا پڕ بوو لە هەراو ئاژاوە.
٢- بەرگەشتە: شکاو و گەڕاوە دوا. موژگان: برژانگەکان. غالیب: زۆربە. مەغلووب: بەزیو.
واتە: چاوت لە بەرانبەری برژاگەکانتدا لەشکرێکی شکاو و گەڕاوە بۆ دوا بوو، بەڵام بۆخۆی بەشی زۆری دڵانی دڵدارانی بەزاند، یا دڵە زاڵەکانی بەزاند.
٣- حەواڵە: ڕەوانەکردن، ناردنی کەسێک بۆ سەر کەسێک بۆ لێ سەندنی شتێک. غەمزە: هێماکردن بە چاو. مەخرووب: وێران کراو.
واتە: تا کەی هێمای چاوەکانت دەکەیتە سەرم و داوای خەرج و باجم لێ دەکەی بۆ دڵت؟ وڵاتی کاول و وێرانی دڵم چیی ماوە لێی بسێنی؟

٤- زوشت ڕوو: ئەوەی دەم و چاوی ناشرین بێ. دیبا: قوماشی ئاوریشمینی ڕەنگاو ڕەنگ. چ حاصڵ: چیی لێ پەیدادەبێ. سورمەسا: وەک کل ڕەش. مەعیووب: عەیبدار.
واتە: بڵێن بەوانەی دەم و چاویان ناشرینە، با جلوبەرگی جوانی ئاوریشم لەبەر نەکەن، هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ و پێی جوان نابن. چاوی عەیبدار وەک کلیش ڕەشی بکەی هیچی لێ ناوەشێتەوە و پێی جوان نابێ، چونکە خۆی لەبنەڕەتدا کتوکوێرە.
٥- میهر: خۆشەویستی. ئیقدام: دەست پێشخەری. عیادەت: سەرلێدانی نەخۆش. مەجرووح: بریندار. یاد کا: یاد بکاتەوە. مەحجووب: پەردەی شەرم بەڕوودا دراو.
واتای ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی پێکەوە دێن.
٦- با هەم: پێکەوە. دوو وشەی «با» و «هەم» ی فارسین، کراون بەیەک. ڕشتە: تاڵ. ڕەهگوزار: ڕێ گوزەر، ڕێ. جوملە: هەموو. جارووب: گسک.
واتە: (واتای هەردوو بەیتەکە پێکەوە): ئەگەر یاری شەرمنم لەڕووی لووتف و خۆشەویستییەوە دەس پێشخەری بکاو بێت بۆ سەرلێدان و هەواڵ پرسینی منی برینداری تیری چاوی، هەموو برژانگەکانمی بە تاڵەکانی دڵم بۆ شەتەک دەدەم و ئەو ڕێگایەی بۆ پێ گسک دەدەم کە بەسەریا دێ.
٧- صەبا: بای سبەینان. بۆ «ی دووهەم»: بۆن. گیسوو: گۆنا. پیراهەن: کراس.
واتە: بای سبەینان بۆنی خۆشی ڕووی یاری پێ گەیاندم و بەو بۆنە ژیاندمیەوە، وەک چۆن بۆنی کراسەکەی حەزرەتی یووسف گەیشت بە لووتی حەزرەتی یەعقووب و چاوی پێی کرایەوە و چاک بووەوە. ئیشارەتە بۆ ئایەتی «انی لآجد ریح یوسف لولا ان تفقدون» واتە: ئەگەر بەدرۆم ناخەنەوە، من بۆنی یووسف هەست پێ دەکەم.
٨- سەروکار: سەر و ساخت. مەگلووب: ئەو یارەی کە مەبەستمە.
واتە: من لە ڕۆژی حەشریشدا هەر بەعیشقەوە خەریک دەبم هەر ئەوەندە ئەو یارەم دەست بکەوێ کە دەمەوێ.
٩- ئوستاد: مامۆستا. ئەیووب: ئەو پێغەمبەرەیە لە ژیانیدا جۆرەها دەرد و بەڵای هاتەڕێ، بەڵام هەر خۆی لەبەریدا ڕاگرت. هەم دەرس: هاو دەرز، ئەو کەسەی لەگەڵ یەکێکی تر پێکەوە دەخوێنێ. مەجنوون: مەجنوونی دڵداری لەیلای عامیری.
واتە: لە عیشقدا هەر من هاودەرزی مەجنوونم و پێکەوە دەخوێنین. لەخۆڕاگرتنیشدا بەرانبەر دەرد و بەڵا هەر من مامۆستای ئەییوبم و فێری دەکەم چۆن خۆی ڕابگرێ.
١٠- فەراغەت: بێ کاری. صەعب: زەحمەت، گران، هیجر: دووری لەیار. ئەکل: خواردن. مەشرووب: خوراوە. مەبەست خواردنەوەیە.
واتە: بێ کاری و بێ یاری زۆر زەحمەتە لەسەر شانی سالم لە کاتی دابڕان و دووری لە یاردا. سالم خواردن و خواردنەوەی بێ تۆ لا ژەهری مارە.

پڕۆژەی لێکۆڵینەوەی
«دیوانی سالم»



# پڕۆژەی لێکۆڵینەوەی «دیوانی سالم»



محەمەد عەلی قەرەداغی

# پرۆژەی لێکۆڵینەوەی «دیوانی سالم»

سالم وەک لایەک لە سێ کوچکەی ئەدەبی کوردی سەردەمی بابان بووە، کۆڵەکەیەکی ئەستوور و پتەوی تەلاری شیعری کوردیشە.

تا ئێستە ئەوەی بۆ شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کوردی وەک: نالی و، کوردی و، مەحووی و، وەفایی و،... تاد کراوە، بۆ سالم نەکراوە.

لە سەردەمی ژیانی خوالێخۆشبوو کاک فاتیحی مامۆستا مەلا کەریمدا، لە تەک مامۆستای باوکیدا، ڕەنجێکی باشیان بۆ لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم دا، دوای کۆچی دوایی کاک فاتیح، ئەو پرۆژەیە وەستا و دوای کۆچی دوایی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمیش پرۆژەکە کەوتە لای کاکە حەمەی کوڕی مامۆستا.

کاکە حەمە هەر لە دوای کۆچی دوایی کاک فاتیحەوە، پرۆژەی دیوانی سالمی وەک کارێکی سەرەکیی خۆی داناوە و چاوەڕوانی ئەوە بووە لە هەلی لەباردا بیخاتە گەڕ و ئەنجامی بدات. بەڵام من وەک لە نزیکەوە ئاگاداری ژیانی کاکە حەمە بووم، کاری لاوەکی و ڕوولێنانی ئەم و ئەو بۆ ئیش و کار و پرۆژەیەک کە نەدەبوو کاکە حەمە بچێتە ژێر باریان و، کاری تایبەتیی و بنەڕەتی ئەو کەسانە خۆیان بوون.. کاکە حەمە کات و وزەی زۆری بەفیڕۆ چوو، بەرنامەی کاری خۆی سست و ئیفلیج بوون. ئەم بابەتە قسە زۆر هەڵدەگرێت.

بەهەرحاڵ، لەم ساڵانەی دواییدا کە کاکە حەمە وزەی لەش و دیدی چاوی زۆر لاواز بوون و ئەو کەسەی لە نزیکەوە نەیبینێ نازانێ چ ئازارێک دەچێژێت بۆ خوێندنەوە، یان نووسینی بابەتێک، ئا لەم حاڵەدا کاکە حەمە بای داوەتەوە بەلای دیوانی سالمدا، چۆن بتوانێ و بۆی بکرێت کاری بۆ دەکات، بەڵام کاکە حەمەکەی دیوانی نالی و مەحوی و فەقێ قادری هەمەوەند و خوسرەو و شیرین نا.

هیوادارم -و ڕۆشنبیرانی کوردیش لەتەکمدا — کاکە حەمە بتوانێ ئەم کارەی دیوانی سالمیش بخاتە پاڵ شاکارەکانی «بنەماڵەی مودەڕیس»، بەڵام گومان لەوەدا نییە، ئەو کارەی دیوانی سالم کە زیاتر لە چارەکە سەدەیەک لەمەوپێش ئەنجام دراوە، لە تەک ئەمڕۆدا جیاوازیی زۆری هەیە.

لەم ماوەدا بواری ڕۆشنبیری کوردی و لێکۆڵینەوەی زانستی، گۆڕانکاری زۆری بەخۆیەوە دیوە، ئاسۆی پشکنینی کتێبخانە جیهانییەکان فراوان بووە، گەلێک «بەیاض» و کەشکۆڵی شاعیرانی کورد سەریان هەڵداوە کە لەسەردەمی لێکۆڵینەوەی دیوانی سالمی مامۆستای مودەڕیسدا باسیان نەبووە و کەس ناویانی نەزانیوە. بارودۆخی تەکنەلۆجیا زۆر گۆڕاوە، ئەوەی ئێستا لە ماوەیەکی کەمدا ئەنجام دەدرێت پێشتر زۆر زۆری ویستووە. کاری «لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم»یش، بۆ ئەوەی سێکوچکە و سێپاکە لارەسەنگ نەبن، ئەمڕۆ بێت یا سبەی، دەبێ ئەنجام بدرێت و تەلاری شیعری کوردیش بەو کارە پتەوتر و شکۆدارتر بێت.

من لەم هەلەدا پرۆژەی لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم وەک لە «بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم» (١) دا پێشکەشم کرد، دەخەمەوە ڕوو، بەهیوای ئەوەی- تا زووترە و، کار لەکار نەترازاوە- بە گوڕ و تینێکی باشەوە لا لە دیوانی سالم بکرێتەوە و ئەوەی پێویستە و شیاویشیەتی بۆی بکرێت.

هەر شارەزایەک لە بواری شیعری کوردیدا، سەرنجی دیوانی سالم بدات، دەزانێ کە شیعرەکانی سالم ڕەنگدانەوەی ڕۆشنبیریی قووڵ و بڵاوی ئەو سەردەمەی سالم و پێش ئەو سەردەم و ڕۆژەشن. سالم شیعرەکانی کردووە بە سەرچاوەی ئاماژە بۆ ئەو ڕۆشنبیرییە فراوان و بەرینە. لە هەر بەیتێک — تەنانەت لە نیوە بەیتیش —دا ئاماژە بۆ ڕووداوێک، بەسەرهاتێک، زانستێک، پەندیک، چیرۆکێک، ئەفسانەیەک، باوێکی کۆمەڵایەتی... دەکات، ئەو بابەتانە لەوانەیە هەندێکیان سالم خۆی دیبنی و تیایاندا و لە تەکیاندا ژیابێ، هەندێکیانی بیستبێ، ئەوانی دی خوێندبێتەوە، بەو جۆرە خەرمانێک لە زانیاریی بڵاو و گشتگیر و هەمەڕەنگی لەلا کۆبووەتەوە. دیوانەکەی بەروبوومی سووری ئەو خەرمانە ڕەن بەرز و باڵایە. خوێنەرێک لەو سەردەمەدا نەژیابێت و خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فراوان نەبێت، بێت ئێستە هەڵزنێت بە کێوی بەرز و سەخت و پڕ کاو و لاپێ و نشێوی دیوانی سالمدا، دەبێ چۆن بتوانێ بگاتە لوتکەی مەبەست؟

من گەلێ بیرم لەم کارە کردووەتەوە و بۆ ڕێگەیەک گەڕاوم کە لێکۆڵەر بتوانێ لێیەوە بگاتە ئەنجامێکی شیاو و دروست، بەڵام پەییم بەو ڕێگە نەبردووە. چونکە- وەک نووسیم — ڕۆشنبیرییەکەی سالم ئەوەندە گشتگیر و فرە لق و پۆپە، لەوانە نییە کەسێکی ئەم چەرخە بەتەنیا خۆی بە هەموو لایەنێکیدا بگات و توانای بەسەر هەموویدا بشکێ.

لە ئەنجامی ئەمەوە من ئەوەم بە بیردا هاتووە کە ئەم کارە بە یەک کەسی ئەم سەردەمە هەڵنەسوورێت، دەبێ بیر لە ڕێگەگەلی دیکە بکرێتەوە، یەکێک لەو ڕێگایانە:

دیوانی سالم بەش بکرێت بەلای کەمییەوە بە دوو بەش:

بەشی یەکەم: غەزەلیات و دڵداریی، دەکرێ بۆ دۆزینەوەی مانا و مەبەستی شوێنی نامۆ و یاخی لەم بارەوە لە دیوانی سالمدا بە گەڕان بە دیوانی شاعیرانی دیدا و پەنابردن بۆ ئەو وشە و زاراوانەی ئەوان بەکاریان هێناون و لە ڕێگەی زانینی ماناکانی ئەوانەوە ئەمانەیش شی بکرێنەوە و گرێکوێرەکانیان بکرێنەوە.

بەشی دووەم: کۆمەڵایەتیی و هەجو و دەروونناسی و دەریانەوەردی و گەردووناسی و.. لەم بوارانەدا سالم وشە

و ڕستەی وەهای بەکارهێناوە، ڕەنگە بەو شێوە نەچووبنە فەرهەنگ و قامووسە جۆرا و جۆرەکانەوە و بەشێکیان ئەزموونی خۆی بن، یان لە ئەزموونی کەسانی هاوچەرخی خۆی وەری گرتبن. کێشەکە لێرەدایە و ئەمانە زۆریان لەوانە نین بە کۆششی تاکە کەس بزانرێت و پەی بە مانا و مەبەستیان ببرێت.

ئەگەر بگونجێ دەکرێ بیر لەوە بکرێتەوە بە شوێن کەسانی شارەزا و کارامە و ئاگادار لە ڕۆشنبیریی گشتی و زانیارییە هەمەڕەنگەکاندا بگەڕێین و ئەو پارچە شیعرانەی ئەو بابەتانەیان تێدایە – دوای ئەوەی چیان بۆ کرا – کراو لێکۆڵینەوەیان لەسەرکرا – کۆپی بکرێن و بنێرێن بۆ ئەو کەسانە– لەهەر کوێ هەبن – و داوای یارمەتییان لێ بکرێت و چییان پێ دەکرێت لەو بابەتەدا، ئەوانیش بەشی خۆیانی تێ بخەن و ڕاوبۆچوونی خۆیان لەسەر شوێنە نەزانراو و نامۆکان دەرببڕن و بە نووسین وەڵام بدەنەوە. دەکرێ ئەمەش لەڕێگەی مەڵبەندێ، لایەنێک، دەزگایەکەوە ئەنجام بدرێت. جا ئەگەر ئەو کەسانە بە دەم ئەم داوایەوە بێن و هیمەت بکەن و دڵسۆزانە بەشداریی لەو هەوڵەدا بکەن، دەکرێ بە کۆششی هەمەلایەنە ئەوە بکرێت کە لەوانە نییە تاکە کەس هێزی بەسەریدا بشکێ.

دەکرێ بۆ ئەمە تەنیا داوا لە شارەزایانی ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستان نەکرێت، بەڵکو پەنا بۆ شارەزایان ببرێت لە هەر کوێ و هەر وڵاتێک ببن. هەروەها دەبێ بەڵێنی ئەوەش بەو کەسانە بدرێت کە مافیان پارێزرا و دەبێت و لە کۆتایی کارەکەدا ناویان دەبرێت و خەڵات و پاداشتیشیان دەدرێتێ.

دەشکرێت لەناو ئەو دەقانەدا کە بەملا و لادا دەنێررێن، شوێنی مەبەست دیاری بکرێت و پەنجە بخرێتە سەر ئەو شوێنانە کە زیاتر جێگەی بایەخن و زانینی مانا و مەبەستیان پێویستە.

## سەرچاوەکانی دیوانی سالم

ئـەوانـەی کە پێشتر نـووسـراون، هەنگاوگەلێکن دوای لێکۆڵینەوە، یان لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەنرێن. بەڵام پێش دەسبەکاربوون و پێش هەنگاوی لێکۆڵینەوە دۆزینەوە و کۆکردنەوەی سەرچاوە هەیە. ئەم هەنگاوە لە هەنگاوی خودی لێکۆڵینەوەکە کەمتر نییە و، بەڵکو بێ ئەمە لێکۆڵینەوە ئەنجام نادرێت و هەرچی بکرێت – بێ ئەوە– کرچ و کاڵ و بێ هێز دەبێت.

وەک پێشتر گوترا لەوکاتەوە مامۆستای مودەڕیس و کاک فاتیحی کوڕی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دیوانی سالم کردووە، تا ئێستە بارودۆخ زۆر گۆڕاوە و سەرچاوەگەلی نوێ دەرکەوتوون و. زانیاری تازە دۆزراوەتەوە. بۆیە دەبێ پێش دەسبەکاربوون هەوڵی چڕ و پڕ و سەر و مڕ بدرێت بۆ دۆزینەوەی ئەو سەرچاوانە و لەهەرکوێ و لای هەر کەس هەبن بە داوا و بانگەواز و پوول و پارە و کڕین... ئەو سەرچاوانە دەست بخرێن. ئەوسا هەڵبسەنگێنرێن و بابەتبەندیی و پۆلێن و پلە پلە بکرێن و ناوی خودای لێ بهێنرێت و بە هەنگاوی ورد و لەسەرخۆ شان بدرێتە بەر باری لێکۆڵینەوەکە.

بۆ ئەمەش من لە ئاستی خۆمەوە بەڵێنی ئەوە دەدەم، هەرچیم پێ بکرێت – بێ بەرانبەر – درێخی ناکەم و چی سەرچاوەم لە لایە دەیانخەمە بەردەستی ئەو لیژنە، یان ئەو لایەنەی کاری لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم ئەنجام دەدات.



دەستنووسی شیعری سالم



لێرەدا ناوی چەند دانە لەو دەستخەت و بەیاض و کەشکۆڵانە دێنم کە جێگەی بایەخن و پێشتر لە لێکۆڵینەوەی دیوانی سالمدا سوودیان لێ نەبینراوە:

## ١- کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەلی:

لەتەک ئەوەدا ئەم کەشکۆڵە یەکێکە لە کەشکۆڵە هەرە ڕەنگینەکانی دەستخەتخانەی کوردی، خاوەنی کەم کەشکۆڵم دیوە بەشێوەی ئەم بایەخی بە کەشکۆڵەکەی دابێت و جێگەی تایبەتی لە دڵ و دەروونیدا بۆ دانابێت!

کام نووسەرەوە و ئەدیب و ڕۆشنبیرمان بەشێوەی مەلا فەتاحی خاوەنی ئەم کەشکۆڵە ئاوا سوێندی خواردووە؟:

«هەزار جار بەخوا! هەزار هەزار جار بەخوا و بە قورئان و بە پێغەمبەر، سوێندم خواردووە و سوێند دەخۆم! ئەم کوللییاتی مەولەوییە لەگەڵ شیعری نالیدا، تا گیان لە لەشمدا بێت نە بەکەسی دەبەخشم، نە بەکەسی دەفرۆشم. با کەس خەیاڵی خاو نەکات و گەوهەری خۆی لە سەنگ نەدات! چونکە بەزەحمەتێکی زۆر دەستم خستووە و جێگەی داوا و تەکلیف نییە!»

ئەم کەشکۆڵە «٦٧٠» لاپەڕە زیاترە، بەرهەمی گەلێ لە شاعیرە ناسراو و نە ناسراوەکانی کوردی تێدایە و بایەخی زۆری بە مەولەوی و کوردی و نالی و سالم و... شاعیرانی دیکە داوە. بەرهەمی شاعیری وا هەیە تەنها لە لای ئەم هەیە. وەک «جەفایی» کە سەرلەبەری دیوانەکەیم لەم کەشکۆڵە وەرگرت و چاپم کرد.

ئەم کەشکۆڵە پتر لە «٩٠» پارچە شیعری «سالم»ی تێدایە، گەلێ شیعری بڵاونەکراوەیان تێدایە. تا ئێستە بۆ دیوانی سالم سوودی لێ وەرنەگیراوە. وێنەیم لەلایە و ئەسڵەکەی لای نەوەی شێخ مارفی نەرگسەجاڕە و لە ژمارە «١٢ — ١٣»ی ساڵی ١٩٧٨ی پاشکۆی عێراقدا بە درێژیی لەسەریم نووسیوە.

## ٢- کەشکۆڵی تۆفیق:

ئەم کەشکۆڵەش یەکێکە لە کەشکۆڵە ڕەنگین و نایاب و کەموێنەکانی دەستخەتخانەی کوردی. نووسەرەوەکەی خەتخۆش و وریا و گوڵچنێکی زرنگی باخچەی شاعیرانی کورد بووە. شارەزایانە و لەسەرخۆ گوڵچنی کردووە و بەرهەمی گەورە شاعیرانی کوردی بەو خەتە خۆشەی ڕازاندووەتەوە.

جگە لە شاعیرانی فارس بایەخی زۆری بە شیعری مەولانا خالید و مەولەوی و نالی و کوردی و وەفایی و حاجی قادر و شێخ ڕەزا و — فەوزی — شێخ عومەری بیارە و ×اهیر بەگ... داوە.

ئەوەشی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە نزیکی «٤٠» پارچە شیعری «سالم»ی لە کەشکۆڵەکەیدا کۆکردووەتەوە.

## ٣- کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵلای قزلجی:

ئەم کەشکۆڵەش بەری ڕەنجی مامۆستایەکی مەلا و خوێندەواری باش و ڕۆشنبیر و کوردپەروەرە. کاتێ لە کوردستان دوورکەوتووەتەوە و لە بەغدا نیشتەجێ بووە- دیارە- گەڕاوە لەو ئاوارەییەدا بە خەتە خۆشەکەی شیعری شاعیرانی کوردی کۆکردووەتەوە و نووسیویەتییەوە. کاتێ سۆزی نیشتمان لە دڵیدا جۆشی سەندووە بەو شیعرانە خۆی لاواندووەتەوە.

نازانین سەرچاوەی شیعرەکانی کێ و چ کتێب و کەشکۆڵێک بوون، بەڵام ئەمیش وەک نووسەرەوە شارەزاکانی



دەستنووسی شیعری سالم


۵۰۳

تمت شد

این قصیده حضرت نالی در قسطنطنیه مخصوص احوال الرسی

ملک بابان فرستاده است

۹۵


۵۰۳

۹۴

کەشکۆڵانی دی زانیویەتی چۆن گوڵچنی کردووە و بەری ڕەنجی دڵسۆزانە و گەڕانی بێ وچان و پسانەوەی شیاوی ڕێز و مایەی سوود و قازانجی لێکۆڵەرەوانە.

لەو شاعیرانەی مامۆستای قزڵجی بەرهەمیانی کۆکردووەتەوە و بایەخی باشی بە شیعرەکانیان داوە: نالی و شێخ ڕەزا و خاکی و... چەند شاعیری دیکەیە، بەڵام خۆشبەختانە بایەخێکی باشی بە دیوانی سالم داوە و تێکڕا زیاد لە «۱۲۵» سەد و بیست و پێنج پارچە شیعری ئەم شاعیرەی لە کەشکۆڵەکەیدا کۆکردووەتەوە.

بایەخی تایبەتی ئەم کەشکۆڵە لەوەدایە خاوەنەکەی مامۆستایەکی زانا و ئەدیب و شارەزا و بەتەنگ کارەکەیەوە بووە و کەشکۆڵەکەی بۆ خۆی نووسیوەتەوە.

خۆشبەختانە لە خزمەت ئەم ڕەنجەی ئەم مامۆستا مەزنەدام و کەشکۆڵەکەی یەکێکە لە سەرچاوە بە بایەخەکانی کتێبخانەکەم.

## ٤- کەشکۆڵی گوڵزاری بەهار:

ئەم کەشکۆڵە یەکێکە لە کەشکۆڵە ڕەنگینەکانی کتێبخانەی کوردی و نووسەرەوەکەی زۆر باشی بۆچووە کە ناوی ناوە «گوڵزاری بەهار»، چونکە ئەم دەستخەتە گوڵزارێکی ڕەنگینی بۆن و بەرامە خۆشی کەموێنەیە، لە باخچەی هەر شاعیرێک، چەپکە گوڵی ڕەنگامەی بۆنخۆشی بۆ هێناوە.

لەناو ئەو شاعیرانەدا بایەخی باش بە دیوانی «سالم» دراوە، جگە لەوەی دیوانی سالمیش لەم کەشکۆڵەدا بەشی خۆی لە شێواوی و شپرزەیی و لەناوچوون بەرکەوتووە، هێشتا نزیکەی «٥٠» پارچە شیعری نایابی سالمی تێدا ماوەتەوە، کە بۆ کاری لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم یارمەتیدەرێکی باشی نوسخەکانی دیکە دەبن.

باسی ئەم کوشکۆڵەم بە درێژیی لە بەرگی شەشەمی «کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی»دا کردووە و ناوەڕۆکی ئەم کەشکۆڵە بەشی زۆری ئەو بەرگەی پێکهێناوە.

ئەم کەشکۆڵەش یەکێکی دییە لەو سەرچاوە نایابانەی کەلەپووری ئەدەبی کوردی کە لە کتێبخانەکەمدا پاراستوومە.

## ٥- کەشکۆڵی سەیید محەمەد:

یەکێکی دی لەو سەرچاوانەی بایەخێکی باشیان تێدا بە «دیوانی سالم» دراوە، کەشکۆڵی سەیید محەمەدە، ئەم کەشکۆڵە لە رووی ڕێکوپێکی و باش پارێزراوییەوە کەموێنەیە.



یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کەشکۆڵە ئەوەیە سەیید محەمەد فیهرەستێکی وردی بۆ شیعرەکانی کردووە و بەرانبەر بە شیعرەکانیش لەتەک فیهرەستەکەدا سەرەتای پارچە شیعرەکانی شاعیرانی ناو کەشکۆڵەکەی نووسیوە. شیعری گەلێ لە شاعیرە ناودارەکانی کوردی لە تەک شیعری گەلێ شاعیری نەناسراودا لە خۆگرتووە. لەناو ئەو شاعیرە ناسراوانەدا بایەخێکی تایبەتی بە شیعری سالم داوە و لەم کەشکۆڵەدا «٢٠» پارچە شیعری سالم هەیە. وێنەی ئەم کەشکۆڵەم لەلایە، ئەسڵەکەی لەلای برای بەڕێزم دوکتۆر فایزی مەلا بەکر پارێزراوە.

## ٦- کەشکۆڵی نەناسراو:

ئەم کەشکۆڵە کە ئەم ناوەم بۆ دانا، کەشکۆڵێکی قەوارە مامناوەندی، پەڕە زۆری، ڕەنگینی، بەخەتی خۆش نووسراوەیە، بەداخەوە نە لەسەرەتاوە و نە لەکۆتاییەوە ناوی کەسی پێوەنییە. ئەو سەربازە نەناسراوە ئەو ڕەنجە کەموێنەی داوە و ئەو هەموو ئەرک و شەونخوونییەی بە نووسینەوەیەوە کێشاوە، کەچی بە دوو وشە لە پەراوێزێکدا ناوی خۆی نەبردووە.
کەشکۆڵەکە «٥٢٣» لاپەڕەیە، بەرهەمی زیاد لە «٢٢٠» شاعیری تێدایە، بەداخەوە بەشی زۆری بۆ شیعری فارسی و بەرهەمی شاعیرانی فارس داناوە، بەرهەمی تەنیا «١٤» شاعیری کوردی تێدایە کە ئەمانەن:
ڕەمزی، سالم، سابیری، فەتحی، فیکری، قادر نالی هیجری، مەحوی، ئاهی، ئەختەر، بیمار، فایەق، مەلا عوسمان، حەزین، خەستە، «١٦» پارچە شیعری سالمی تێدایە.
لە لاپەڕەی یەکەمیدا مێژووی ساڵی «١٣٣٣»ی پێوەیە، بەڵام نازانم ئەو مێژووە چییە.
دوای هەندێ بەڵگە و بۆچوون گومانی ئەوەم بۆ پەیدا بووە ئەم کەشکۆڵە خەتی مامۆستا «سەعید صیدقی کابان» بێت.
ئەم کەشکۆڵەش یەکێکی دی لە کەشکۆڵە نەوازەکانی کتێبخانەکەمە.

## ٧- مینای شکستە:

ئەمە دەستخەتێکی گەورەی خوالێخۆشبوو مامۆستا نەجمەدین مەلایە، پتر لە «٣٤٠» لاپەڕەی قەوارە گەورەیە، شیعری زۆربەی شاعیرە ناودارەکانی کوردی تێدایە، بایەخێکی زۆری بە دیوانی سالم داوە، دوای نووسینی کورتەیەکی ژیانی لە بارەی شیعرەکانییەوە نووسیویەتی:
«دیوانی سالم لە شاری بەغدا لە لایەن محەمەد تاهیری مەریوانی ساڵی ١٩٣٣ م چاپ کراوە. بێجگە لەوەی کە چاپ کراوە گەلێ هەڵبەستی شیرینی غەرامی وە تەئریخیشی هەیە کە داخڵی ئەو دیوانە چاپکراوە نەکراوە. ئێمە ئەو هەڵبەستانە لەم دەفتەرەدا دەنووسین. بە نیشانەی «چ، ن» ١٩٤٠/٤/١٩. مامۆستا نەجمەدین مەلا سلێمانی» «ل:١٣٤».
دوای ئەمە مامۆستا نەجمەدین مەلا پتر لە ٨٠ پارچە شیعری سالمی نووسیوە، دوای ئەوەش نووسیویە:
«بە کۆمەکی یەزدان هەڵبژاردەی دیوانی سالم تەواو بوو بە قەڵەمی بەندەی بێ نەوا مامۆستا نەجمەدین مەلا لە شاری سلێمانی لە شەوی پێنج شەمەی ١٨ی ربیع الاول ١٣٥٩ هـ ڕێکەوتی ٢٧ی نیسانی ١٩٤٠م. هیوام وایە خوێندەواران لە نارێکی نووسینەکەم ببوورن، چونکە؛ لە وەختێکی پەرێشانی و بێ زەوقیدا نووسیومەتەوە)).
ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەی مامۆستا حەمە بۆردا پارێزرا بوو، دوایی وەک زانراوە کتێبخانەکەی فرۆشتووە بە «........» و دەبێ لە کتێبخانەی ئەودا پارێزرابن.
وێنەی ئەم دەستخەتەم لە لایە.

## - دەستخەتی سنە:

ئەو دەستخەتەیە کە عەلی ئەکبەری کوردستانی ساڵی ١٣٢١ک نووسیویەتییەوە و، تێکڕا — ئەوەی کە ماوە — «١٢٤» لاپەڕەیە، بەزۆری شیعری سالمە. دەستخەتەکە شپرزە بووە و لێی لەناوچووە و دوایی یەکخراوەتەوە، بەڵام یەکخستنەوەی زۆر وەستایانە نییە.
دەستخەتەکە شیعری بڵاونەکراوەی سالمی تێدایە و بەدرێژیی لە لاپەڕە «٣٢»ی «بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم»دا باسیم نووسیوە.

## - دەستخەتی ئەحمەد ئاغا:

ئەم دەستخەتەش یەکێکە لە دەستخەتە پڕ بایەخەکانی دیوانی سالم و ئەمیش — چەند بارە بەداخەوە — شیرازەی پساوە و لە چەند جێگەیدا کەوتن و لەناوچوون هەیە. ناوی نووسەرەوە و شوێنی نووسینەوەی دیار نییە. لە کۆتاییەوە نووسەرەوەکەی دەڵێ: بۆ ئەحمەد «ئاغا»م نووسیوەتەوە. دیاریش نییە ئەحمەد ئاغاکە کێیە.
باسی ئەم دەستخەتەشم لە لاپەرە «٢١»ی بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالمدا بەدرێژی نووسیوە.(١)

### پەراوێز:

(١) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم، دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم. ٢٠١٠



# سالم و وشەیەك بۆ مێژوو

دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین

**ناوەڕۆکی ئەم باسە:**

لە نیوەی دووەمی مانگی سێی (٢٠١٢) و لە سێیەم فێستیڤاڵی "ئۆرموون ماچۆگۆ بۆ وێژەی ماچۆ" لە شاری سلێمانی، برا و نووسەری دڵسۆز"کاروان عوسمان خەیات-ڕێبین-"، ئاماژەی دا بە یەکێک لە گەشتە ئەدەبیەکانی بۆ دەڤەری هەورامان و ڕۆژهەڵاتی کوردستان و وتی: دیوانێکی دەستنووسی سالمی شاعیرم چنگ کەوتووە. بە باشمزانی بە نووسەرێکی بدەم لەو بوارەدا ماندوو بووە.. ئەویش کاک "محەمەدی مەلاکەریم"ە... لەسەر ئەو بیرە جوان و هەڵوێستە پاک و دڵسۆزانەیەی ئەو لاوە خوێنگەرم و عاشقی وشەی پیرۆزی کوردی، بێ دەنگبووم، نەبا دەربڕینی هەر گوزارشتێک ببێتە مایەی ئەوەی کاک کاروان لەو حەماسەتە گەرم و چالاکییە بە شەوقەی سارد بێتەوە... من لە دڵی خۆمدا وتم: ڕەنجی ئەم لاوەش، وەک پرۆسەی چاپکردنی "چاپی یەکەم"ی دیوانی مەحوی لێبەسەردێت!! ئەوە بوو کاتی خۆی لە وتارێکدا لە "ئاسۆی زانکۆی سلێمانی" ساڵی ١٩٧٨ بڵاومکردەوە، پاش ئەوەی ڕێز و تەقدیر و دەستخۆشیم لە جەنابی مامۆستای پایەبەرز مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کاک محەمەدی مەلا کەریم کرد بۆ چاپکردنی دیوانی مەحوی و ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی لەو پێناوەدا دابوویان.. وەلێ گازاندەی ئەوەم

لە بەڕێز کاک محەمەدی مەلا کەریم کرد، نەئەبوو خاوەنی هەقیقی بەرهەمهێنانی ئەو پرۆسە مەزنە: "ساغکردنەوە، لێکۆڵینەوە، شرۆڤەکردن، ڕاڤەکردن و دیاریکردنی بۆنەی لە دایکبوونی شیعرەکانی" فەرامۆشکات و مافی ئەدەبی هیچ بەڕێزێک لەوانەی هاوبەشی ڕاستەقینەیان لە ساغکردنەوە و توێژینەوەی شیعرەکان بە فیڕۆ بڕوات، چونکە برای بەڕێز کاک محەمەد تاکو هەنووکە سەبارەت بەو هەقیقەتە ددانی پێدانەناوە، ئەمە لە کاتێکدا ئەو وتارەی لە گۆڤاری ئاسۆی زانکۆدا بڵاومکردەوە: بەڕێزان: شێخ محەمەدی مەحوی و کاکەی فەلاح کە هاوبەشی ئامادەکردنی دیوانەکە بوون، لە ژیاندا مابوون.. لەو وتارەدا، ئاماژەم بەوە کرد کە بەڕێزان "گۆران"-ی شاعیر و کاکەی فەلاح و شێخ محەمەدی مەحوی" ئەو دیوانەیان ئامادە کردووە، لە حەقیقەتدا وەک بەڕێز دکتۆر عیزەدین لای ڕوونکردمەوە و شێخ محەمەدی مەحویش چەند جارێک ئاماژەی بەوە داوە کە: مامۆستا مەلا مستەفای حاجی ڕەسولی دێلێژەیی شاعیر و زانا"سەفوەت"یش بەشداری ئەو دانیشتنانەی کردووە و ڕۆڵی دیاری لە ساغکردنەوەی شیعرەکانی مەحویدا بینیوە.. پاش ئەوەی شێخ محەمەدی مەحوی تەواوی پاکنووسی دیوانە ساغکراوەکەی بە جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم گەیاند، دیارە ئەویش لە پیاچوونەوەیەکی شارەزایانەدا لە ڕاڤەکردنی بواری ئاینی شیعرەکاندا ڕۆڵی مەزنی هەبوو، کاک محەمەدیش لە نووسینی پێشەکییەکە و سەرپەرشتی چاپکردندا بە پێزانینەوە زۆر ماندوو بووە! لەم ڕوونکردنەوەیە جگە لە دەرخستنی ڕاستی و هەقیقەت، هیچ مەبەستێکی دیکەم نییە و ڕێز و تەقدیری بێ ئەندازەشم بۆ مامۆستا و کاک محەمەد هەیە.

## ئەی ئەم دیوانەی "سالم"؟

دەمێک نییە، برای بە قەدرم جەنابی کاکە ئەیوب ڕۆستەم بەرپرسی بەشی چالاکی ڕۆشنبیری لە وەزارەتی ڕۆشنبیری، پێی ڕاگەیاندم، بە نیازن لە شاری سلێمانی فێستیڤاڵێکی شیاو بۆ شاعیری مەزنی کورد سالم سازبکەن و پێیان باشبوو لەو چالاکییە ڕۆشنبیری و ئەدەبییەدا هاوبەشی بکەم، ئا لە نێوان ئەو گفتوگۆیەدا، باسی ئەو دیوانەی سالم هاتە پێشێ کە برای بەڕێز کاکە کاروان چنگی کەوتبوو.. تا لە ڕۆژانی فێستیڤاڵەکەدا وەک دیارییەک پێشکەش بکرێت، منیش بەو پێیەی بڕیارمدا بوو، بە توێژینەوەیەک هاوبەشی فێستیڤاڵەکە بکەم، پێمباشبوو وەک ژێدەرێکی نوێ، ئەو بەشە شیعرانەی "سالم" ببینم.. دوای ئەوەی کاکە ئەیوب گفتی ئەوەیدا بۆم پەیدا بکات.. پەیوەندی بە کاکە کاروانەوە کرد و ئەو بەشە شیعرانەی شاعیرم چنگ کەوت. لە خوێندنەوەیەکی سەرپێییدا، بۆم دەرکەوت، نەک ئەوە هەموو ئەو شیعرانە نین کە لە چاپی یەکەمی دیوانی سالمی ساڵی ١٩٣٣دان، بەڵکو کەمترە.. هەر ئەو بۆچوونە وایکرد لە پەیوەندی نێوان من و کاک کاروان ئەم پێشنیازەم خستە بەردەم بەڕێزی: هەقە لە بڕێتی ئەو شیعرانەی سالم کە لە کتێبخانەی ئەنجومەنی شورای میللی لە تاران چنگ کەوتووە. با لەگەڵ هەموو شیعرەکانی سالم (دیوانی سالم ١٩٣٣، دیوانی سالم گیوی موکریانی١٩٧٢، ئەو بەشە شیعرەی کاک محەمەد عەلی قەرەداغی بە ناونیشانی (بەرکوتێ لە خەرمانی شیعری سالم) بڵاویکردونەتەوە، کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا و کەشکۆڵی پەرێشان، کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف و هەر شیعرێکی دی) لە دیوانێکی نوێدا کۆکرێنەوە و چاپکرێن.. بۆ ئەوەی فریای فێستیڤاڵەکەی سلێمانی بکەوێت. بێ لێکۆڵینەوە و ڕاڤە کردن و دیاریکردنی بۆنەی لە دایکبوونی شیعرەکان دیوانەکە چاپکرێت، ئەمە تەنیا وەک ژێدەرێکی بەرین و قووڵ بۆ شیعرەکانی سالم و ئەرکی لێکۆڵینەوە بۆ دواتر دابنرێت.. بە سوپاسەوە کاک کاروان ڕەزامەندی لەسەردا و تێکڕای ئەو شیعرانەی دووتوێی ئەم دیوانە (ئەو) بۆی ناردووم.. پێویستە وەک مافێکی ئەم لاوە لە خۆبوردە، ئاماژە بەو هەقیقەتەش بدەم.. ئەم دیوانە (ئەو) ڕێکیخستووە و پەراوێزی بۆ نووسیوە و ئامادەی کردووە.. من تەنیا پێیدا چوومەتەوە و هەندێک هەڵەی چاپ و لە ڕووی هونەری (دیزاین) و خاڵبەندییەوە چاوم پیاخشاندوون، زیاتر دەستم لەسەر شیعرە فارسیەکان داگرتووە و هەڵەکانم ڕاستکردونەتەوە، هەر هەمووی موڵکی کاکە کاروانە.. خوا یار بێت و مەودا و تەمەن دەرفەت بدات، لە ئایندەیەکی نزیکدا کاری توێژینەوەی زانستانەی لەسەر تێکڕای شیعرەکانی ئەم دیوانەی سالم ئەنجام ئەدەم.

## ئەم چەردە شیعرانەی دیوانی سالم

ڕەنجە بەپێز و کارە درەوشەدارەکەی کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)، هەوڵێکی بەهیممەتی نێو بازنگەی مەعریفی سەردەم چەمکی دیاری زاستانەی دەقی ئەدەبیدا خۆی ئەبینێتەوە.

ئەگەرچی ئەم دیوانەی (سالم) زۆرینەی (نەک هەموو) ئەو شیعرانەی دەستکەوتون لەخۆگرتووە، واتە: (کتێبە چاپکراوەکان وەکو سەرچاوە بەکارهاتوون و لە پەراوێزدا ئاماژەیان پێکراوە)، بریتین لە:

١- شیعرەکانی دیوانی سالم (١٩٣٣) کوردی مەریوانی.

٢- = = گیوی موکریانی (١٩٧٢).
٣- = = سالم (بەرکوتێ لەخەرمانی شیعری سالم) محەمەد عەلی قەرەداغی.
٤- = = کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا.
٥- = = پەرێشان. مامۆستا حەمەبۆر
٦- دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم = = .
٧- دیوانی کوردی بەرگی دووەم مامۆستا حەمەبۆر کۆکردنەوەی شیعرەکانی سالم لەیەک دیواندا وەک ژێدەرێکی دەوڵەمەند بۆ خۆی کارێکی باشە و دەستخۆشی ئەوێت.. هەر چەند نەکرا، دەنا ئەبوو، بەراوردێکی ورد و قووڵی ئەکادیمیانە لەنێوان شیعری تێکڕای سەرچاوەکاندا بکرایە و بۆچوونی تایبەتیش سەبارەت: هونەری شیعری نامەکانی (سالم) و (وەڵامی کوردی) تیشکی زانستانەیان ئاراستە بکرایەتەوە لە بەرگی یەکەمی دیوانی کوردیدا.. سالم ڕوو لە کوردی ئەکات:

ئەی گاسی بـەدەن پور فەرەحی لەزەتی نامت
وەی داغی دڵی خەستە نمەك سوودی کەلامت

## ئەمیش هەڵبەستەکەی دیکەی (سالم)ە



سەوادی ڤیرگوون شەبها لە نوسخەی عەنبەری مووتە
سەراسەر ڕەونەقی دونیا لە عەکسی ئاینیەی ڕووتە
مەثهل ئەستوونەیی دوودی هەناسەم بۆ ڕەوشی و بەرزی
مەکەر پرچی و ڕاز و قامەتی لاو لاوی هەڵچووتە
بەناحەق کوشتمی موژکانی خوێنڕێژت، وەلێ زانیم
لەگەڵ من ئەم هەموو کەج بازیە تەحریکی ئەبرووتە
بەدەوری لوئلوئا غەوواصی زەنگیی دانەیی خاڵت
بە(ظاهیر) پاسەوانی کوڵمی مەرجان، لێوی یاقووتە
سیەهـ ڕووبم، وەکو زولفت، سەری موو کەر خیلافی بێ
بەحەققی میصحەفی ڕوی تۆ، (دز)ی دڵ، خاڵێ هیندووتە
وەکو موژکانی تۆ، بەرگەشتەیە طالع بەرووی مندا
پەرێشان زولفی موشکینت، لەگەڵ ئەحواڵی من، جووتە
جەوازی دا حەکیم: بادامی چاوو شەککەری لێوت
لەقانوونی ویصالا، بۆ دڵی من، قووەتی قووتە
بەهەشتە وەصلی تۆبۆ من، لەبن داری موغەیلاندا
لەوەختی دووریا، گوڵشەن وەکو صندوقی تابووتە
دڵی ساحیری لەبەر زولفو زەنەخ ناگاتە ڕوخ هەرگیز
لەلایێ حەلقەیی ئەفعالە لایێ چاهی هارووتە
عەصای مووسا لەکوێ بێنم ڕەهایم دا لەدەس چاوت
لە (ماە) تاپشتی (ماهی)، گشتی، خۆ بەر حوکمی جادووتە
(بەسێ) دون هیممەتە گەر ئارەزووی ئەو ڕەنگی شاهی کا
هەتا، سەرگەشتە (سالم)، ئووفتادەی سایەیی ڕووتە

## وەڵامی (سالم) بۆ (کوردی)

ئەی طاسی بەدەن پۆڕ فەرەحی لەذذەتی نامت
وەی داغی دڵی خەستە نمەك سوودی کەلامت
ئەی سونبولی زوڵفت هەمە دەم عەطری مەشامم
وەی زێوەری سەر چەشمەیی چەم قەددی نەمامت
ئەی گەردنی جانم بەئەبەد حەبسی کەمەندت
وەی مورغی دڵی شێفتە پەڕبەستەی دامت
ئەی جان بەفیدای نوکتەی شیرینی دەهانت
وەی سەر بەنیساری قەدەمی پەیكو پەیامت
قاصید لەتەرەف تۆوە سەلامێکی کە هێنا
قوربانی وەفای دەمبەدەم و جەوری مودامت
قاصید نییە ئەم پەیکە مەگەر خدری نەجاتە
بەخشیی بەمنی موردە حەیاتێ بە سەلامت
ئارێ کە دڵ ئاوێنەی دڵ بێ چ عەجائیب
قەستەم بەسەرت شێفتەترە بۆت کوڕی مامت
تۆ نیتە مەگەر ئارەزوویی دیدەنی مەهجوور؟
سا دەی وەرە ئەی مەردمەکی دیدە مەقامت
تا سەجدە بەرن، کەبکی دەری بۆ بەری پێی تۆ
سا هەستە، بکەن خۆش ڕەوشان مەشقی خەرامت
کوشتت، کە هەموو مونتەزیری شۆڕشی حەشرن
قەد دەرخە هوەیدا کە قیامەت بەقیامت
تأثیری عەشق، یانە لە ئەوصافە فلاَنی
(سالم) کە تکا شەهدی چەکیدەی، لە کەلامت

لەبەرگی دووەمـی دیوانی کوردیدا (سالم) بەم غەزەلە وەڵامی نامەیەکی شیعری کوردی ئەداتەوە
سەودای ڤیرگوون، شەبها لەنوسخەی عەنبەری موونە
سەراسەر ڕەونـەقی لەعەکسی ئاییئەی ڕوونە.

.
.
.
.

ئەو غەزەلە لە هونەری بەجوان و هەست ناسکەیە، بەهەق پێویستیان بە توێژینەوەیەکی ئەکادیمیانە و نەکرا لێرەدا ئەو ئەرکە بەجێبێنرێت.
ئەوڕەحمان بەگی ساحێبقڕان جگە لە نازناوی (سالم) دوو نازناوی دیشی وەیاڵنراوە:
أ- نازناوی ڕەنجووری
ب- = = بیماری
هەردوو نازناوەکە مشتومڕێکی گەرموگوڕیان لەسەر کراوە

و تاهەنووکە نامەیەکی سەلماو و چەسپاوی ئەکادیمیانەی لەسەر سەقامگیر نەبوو.. سالم تا هەنووکە شیعری بەنازناوی ڕەنجووری چنگ نەکەوتووە. جگە لەو شیعرانەی (مەلا عومەری ڕەنجوور)ی کە نازناوی ڕەنجووری لەخۆگرتووە، وەلێ سەبارەت نازناوی بیمار، هەر لەشیعرەکانی سالمدا.. ناوی بیمار لەدووتوێو ناوەخنی (فەرد)، یاخود (بەیت) ێکی شیعرەکانیدا هاتووە، ئەمەش نموونەی شیعرێکە نازناوی بیماری لەخۆگرتووە.

لەژێر ڕەشماڵی نازناوی (بیمار)دا پەخشبووە، ئەوەش پێویستی بە شرۆڤە و ڕاڤەکردنێکی تیووری و پراکتیکی پێوەری ئەدەبی و هونەری شیعری هەیە:

(١)

ئەمن و خەرووسی ئاسوفتە حاڵ، هەریەك بەدەردێ پڕ خەیاڵ
شەو تا سەحەر خەومان بەتاڵ، ئەو قووقە قووق، من ناڵە ناڵ
پەروانە و من (مقنلاین!) سەییدی دوو سەد دامی بەڵاین
هەریەك بەنەوعێ جانفیداین، ئەو بۆ چرا، من بۆ جەماڵ

.
.
.

ماهی سەومە نزدیکی عید، سالم بە (عەید)ن پڕ ئومێد
بۆ سەومی من ئەبرۆت نەدید، زاهیر دەکا ڕۆژووم بەتاڵ
قوربان ئەمن (بیمار)ی تۆم، مات و زەعیف و زاری تۆم
بێ خاو و شەو بێداری تۆم، تۆش جارێ من بێنە خەیاڵ

(٢)

ئەگەر غەم ماڵی دنیا بێ، حەریفی خواجە نوعمانم
ئەگەر شادی بە دەوڵەت بێ، ڕەفیقی مام سولەیمانم
هەناسەم گەر فەلەك نەگرێ، فولك بگری بەحەققی نووح
لەدەریای ئەشکێ نووحم، تابیعەی هام فولکی تۆفانم

.
.
.
.

ئەگەر سەد شۆخی وەك یوسف لەمیسرا هامنشینم بن
بەبێ تۆ هێندە دڵ قەبزە، دەڵێی، مەحبووسی زیندانم
بەسۆفاری خەدەنگی کافر، (بیمار) و ئوفتادە
موسوڵمانان، موسوڵمان بن عیلاج، ئاخر موسوڵمانم!

(٣)

پەنجەی بۆ تەسوویری ئەبرۆت پەیڕەوی مانی دەکا
خامە زنجیری گێسووتە، عومر ئەفشانی دەکا
قووتی ڕۆحە لێوەکەت یاقووتی ئاودارە کوڵم
مەنعی بازاڕی عەقیق و لەعلی ڕوممانی دەکا
گەر لیرەیی ناز وە ئاواز تۆ بگرێتە گوێ
تووتی شیرین زوبان، چون عەزم خۆشخوانی دەکا
قامەتی نەوخێزی شیرینت، نەهاڵی جەننەتە
سەرووی ڕەعنای لەلات کەی مەیلی هامشانی دەکا؟
بەرگی سەرتاپام نمود بێ بەشەرتێ تۆم ببێ
تاراو و بەرگی لەلام، سەد شاڵی کرمانیی دەکا
دڵ بەنەشئەی عەکسی مەستی چاوەکەت لایەعقەلە
بۆ کەبابی جەرگی من، لێوت نمەکدانی دەکا
سا هەزار جارت دەخیل بم، حەرفقی بەدکار مەشنەوە
هەرچە دەربارەم بکەی، پیرە شەیتانی دەکا
لێوی یاقووتت نگینی خاتەمی نادر زوهوور
موهری دەستی ئاسەفە ئەمری (سولەیمانی)ی دەکا
کەس نییە ئەو شۆخە حاڵی کا لە سۆزی ئاتەشم
پێی بڵێ: (بیمار)ی شەوقت وا غەزەلخوانی دەکا.

لەبەر ڕۆشنایی چەپکە گزنگی تیشکی خۆری ئەم دەقە شیعرییانە، ئەکرێت بە نەوازشەوە بنووسرێت: کارەکە ژێدەرێکی بەسوودی ئەدەبییە و چاوەڕوانی هیممەتی لێکۆڵەری زانستانە هەیە، بەشێوازگەرییەکی مەعریفیانەی



سەردەم خوێندنەوەی نویێ بۆ شیعرەکان بکرێت و هەموو ئەو لایەنانە، ساغکرێنەوە، تەمومژیان لەسەردا هێنراوە، یاخود سێبەری گومان ڕەونەقی لێبڕیبن.

## (شیعر) لای ئەوڕەحمان بەگی ساحێبقڕان (سالم):

سالمی شاعیر لە خولْقاندنی نوێی شیعرەکانیدا "ڕوخسار و ناوەرۆک" هوشیارانە ڕێچکەی ڕەهەندە بنچینەییەکانی ڕێبازی قوتابخانەی ئەدەبی کلاسیکی گرتووە.. ئەم ڕێبازە لە سەردەمی ئیغریقییەکانەوە لە دایکبووە و بە تەمەنترین ڕێبازی ئەدەبی دائەنرێ و بە تێپەربوونی زەمەن و قۆناغە جیاجیاکانی گۆڕانکاری و پەرەپێدانی فیکری مرۆڤ، لای هەر نەتەوەیەک بەپێی شێوازی فۆنەتیکی زمان و گونجاندنی لەگەڵ نەستی ناسک و هەستی هەستیارانەی مرۆڤ و ڕیتم و ئاوازی مۆسیقای ئەو زمانە و بەهرە و توانا و زیرەکی و زەوقی شیعری ئەو مرۆڤە شاعیرە، لای هەر نەتەوەیەک تایبەتمەندێتی خۆی وەرگرتووە و شێوازی هونەری داڕشتنی شیعری کلاسیکی موڵکی تەنیا میللەتێک نییە و ئەشێت لە زۆر ڕووەوە، هاوئاهەنگی و هاوخەسڵەتبن: ئەوەتا ئەدەبی کلاسیکی بەگشتی و شیعری میللەتانی ڕۆژهەڵات: (کورد، فارس، عەرەب، تورک، هیند.... هتد،) لە ڕووی هونەری داڕشتنەوە، پەیڕەوی عەروزی کردووە، ئەگەر بەر لە دۆزینەوەی دەریاکانی: "خەلیل ئەحمەدی فەراهیدی" شیعری عەروزی هەبووە و لە ڕووی فیکری و ناوەڕۆکیشەوە، عەقڵ تەحەکوم ئەکات و بەهێزی تێژی عەقڵانی جوانیەکەی ئەدرەوشێتەوە و واتای بەرز و قووڵی دەرئەکەوێت، مانای نوێی دیوی ناوەوەی شیعرەکان خۆیان ئەنوێنن و هۆشیاری و هزری مرۆڤ هەوڵئەدات لۆژیکیانە زانست ئەکتیف بکات و کار لەسەر پرۆسەیەکی مەعریفی بکات و تێزی (ڕۆحی بەرخوری، هەستی ناسک و بزوێن و عەقلی مەعریفی و بەهای باڵای ئەخلاق) مرۆڤ کۆنترۆڵی بکات و خواست و ئیرادەکەی بێتەدی و بەوەش ڕەهەندەکانی فیکر چرکەساتی لە دایکبوونی بەرهەمە مەعریفیەکانە و بارتەقای ئەم حاڵەتەیە.. چێژ بە خودی دەق و خوێنەر و خاوەن دەق ئەبەخشێت، وەلێ ئەم حاڵەتە بەدەر لە



نێرگزیەت و لە خۆباییبوونی عەقڵ و یاخیبوونی گەوجانە! ئەو توێژینەوانەی تا هەنووکە سەبارەت: (ژیان و هونەر و ناوەڕۆکی شیعر و ئامانج)ی شیعری کلاسیکی کوردی بە گشتی و شیعرەکانی سالم پێشکەشکراون، پێوەر و کێشەی بە لێکدانەوەی عەقڵیەتی تەقلیدی بووە و دەق وەک: بەند و زەبوون مامەڵەی لەگەڵ کراوە.. ئەمە لە کاتێکدا لە دایکبوونی پرۆسەی مەعریفی هەموو دەقێک بە دەقی شیعری کلاسیکییەوە، ئەبێت ئازادی بە دەق بدرێت و مامەڵەی زانستانەی لەگەڵدا بکرێت و مەعریفیانە و لەبەر ڕۆشنایی تێژی فەلسەفەی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانە خوێندنەوەیەکی ورد و قووڵ بۆ جوانییە شاراوەکان و نهێنی واتاکانی دیوی ناوەوەی دەقە شیعرییەکان بکرێت. ئا بەو شێوەیە، ئەتوانرێت، تا ئاست و ئەندازەیەکی دیار ماف بە هونەری شیعری و واتای ناوەڕۆکی شیعرەکانی سالم بدرێت.

## هونەری شیعری لای سالم:

شیعر ژانرێکی ئەدەبیی درەوشـــەداری هەست بزوێنە و مێشک ئەوروژێنێو دەروون و ناخ ئەهەژێنێ.. بەوەش لەسەر خوانی زێد ئەبێتە خۆراکێکی فیکری لە کایەی کاری هونەری و ئەفراندنی بەهرەی مرۆڤدا خۆی ئەبینێتەوە. شیعری کلاسیکی کوردی جیا لە هەموو جۆر و شێوەی داڕشتن و بنیاتی هونەری ژانرەکانی دیی شیعر خاوەنی: چەندین هـەل و مـەرج و خەسڵەتی تایبەتە، ئا ئەو خەسڵەتانەی سیمایەکی خودی و بەرگێکی هونەری پێ پۆشیوە... بەوەش شیعری کلاسیکی بە گشتی و کوردی بە تایبەت بیەوێ و نەیەوێت پابەندە و پێوەی بەستراوە و لە ژێر کۆنترۆڵیایەتی و ناتوانێ بە ئازادی و ڕەهایی و ڕاشکاوانە پەلوپۆ ببزوێنێ.. ئا ئەو خۆبەستنەوەی شیعری کلاسیکی بە هەل و مەرجەکانییەوە، فاکتەرێکی بەهێزە بۆ مانەوە و بوونی خۆشی ئەسەلمێنێت... ئەوەتا ژانری شیعری کلاسیکی سەرەڕای ئەوەی بە دوای ڕوخسارێکی هونەری بەرز و جواندا وێڵە، ناتوانێت: (ڕیتم، ئاواز، مۆسیقا، کێش) فەرامۆش بکات و لە پابەندبوونی بەهاوسەروایییەوە پەیڕەوی کێشی عەروزی و بەحرەکانی خەلیل ئەحمەدی فەراهیدی نەکات، ئەگەر ئەم زانایە لە بنەچەدا عەرەب نییە و فارسە، وەلێ دۆزینەوە و دیاریکردنی ئەو بەحرە عەروزیانەی بە ڕەوت و بزواندنی وشترەوە بەستۆتەوە... لە دنیای شیعردا، سالمی ساحێبقڕان شارەزایانە داهێنانی لە ئەفراندنی هونەری شیعریدا کردووە و خۆی لە خولقانی وێنەی جوانی دڵڕفێن و چێژ و لەزەتبەخشدا ئەبینێتەوە.. ئەکتیڤکردنی تەکنیک لە بزواندنی وێنە، بە واتا ڕۆحی بە بەردا ئەکرێت، فاکتەری بەهێز و زیندووی بنیاتی پرۆسەی ئەفراندنی وێنەی هونەری لای شاعیرانی کورد، بە بەکارهێنانی فاکتەرە جیاجیاکانی: (ڕەوانبێژی، ڕونبێژی، جوانکاری)یە لە پەنابردنە بەر هێزی ناوەوەی تەکنیکی بنیاتی شیعری، جوانکاری"بەدیع" لە یەک ساتدا لە ناخی وشە و کڵپەی هاواری گڕکانی ئازارەکانیدا، نوقڵانەی مزگێنییەکی هیوابەخش ئەگەیەنێت:

**هەمیسان هاتە سوێ زەخمی دڵی سالم وەکو جاران**
**بە سروەی بای سەحەر یەکدەم کە نەفحەی زوڵفی موشکین هات**

زمان ڕۆڵی هەرە مەزن و دیار و بنچینەیی لە بنیاتی هونەری شیعردا ئەبینێت، ئەوەتا پاش و پێشکردن، بە وشەی "سوێ" و "زەخم" چ وێنەیەکی ئازاراوی چێژبەخشی بە دەقەکە گەیاندووە.

ئـەوە بەهرەی خوڵقاندنی چەمکە جوانەکانی هونەری ڕەوانبێژییە، گیانێکی هەمیشە زیندوو بە بەری شیعرەکەدا ئەکات و ئەبێتە مایەی ئەو هەقیقەتەی، دوای لە دایکبوونی ئەو تێز و بەرهەمە ئەدەبییە.. خۆی لە پرۆسەیەکی زیندووی ئایندەدا ببینێتەوە و شیاوی ئەوە بێت، خوێندنەوەی نوێی بۆ بکرێت، لە کاروانی گەشەسەندندا پێشەنگ بێت..

**دەترسم بێ لـــە نـــاکاوا سموومێ**
**نە دڵ بێڵی، نە گوڵ بێڵی، نە گوڵزار**

هونەری شیعری ئەو بەیتەی شاعیری بەهرەدار لەوەدایە.. یەک وشــەی "سموم- ژەهــر"ی کردۆتە قومبەلەیەک و لەناکاودا بتەقێتەوە و تەلاری نازداری "دڵ و گوڵ و گوڵزار" تێکبدات و هەڵتەکێنێ.

تا لە دوای: زاراوەکانی "دڵ و گوڵ و گوڵزار" ڕووبچێت، بەرەو وێنەی سەرنجراکێشتر بە کێشت ئەکات و داوای خوێندنەوەی نوێ بۆ بە دەستهێنانی مافەکانی ئەکات.

دڵ= هەست، گوڵ= مرۆڤ، گوڵزار= خاکە.

سالم زمانزانێکی دەوڵەمەند و شارەزا و بەهرەوەر بووە.. بە جۆرێکی هۆشیارانە جوڵەی بە وشە کردووە، هانیداون جەنگی لە نێوانیاندا بەرپا کردووە و عاقڵانە و مەعریفانەش، لە پێناو سەرخستنی بیر و عەقیدە و نەریتە شێوەیەکی ئاشتییانە کۆتایی بە جەنگەکە هێناوە، نە ژێرکەوتوو، نە براوەی تیا نەبوو:

**دەڵێم: با تەرکی عەشقتکەم، وەلێ شەرتی وەفا مانع**
**لە جەورت ڕەنگە کافربم، وەلێ خەوفی خـــودا مانع**

ئای چ هونەرێکی ورد و ژیرانەی لە نێوان دەستەواژەی: تەرکی عەشقتکەم و دەستەواژەی: شەرتی وەفا مانعی بەکارهێناوە.

لە عجزی هەمان بەیتدا، ڕێچکەی کاری هونەری "سەدر"ی بەیتەکەی پەیڕەو کردووە:

**(لە جەورت ڕەنگە کافربم بەرانبەر وەلێ خودا مانع)ە**

دیوانی شیعرەکانی سالم لێوا و لێون لە بەهای هەرە باڵای هونەری شیعری، بەوەش جوانییەکی ئێسک سووکی بە ڕوونی ڕوخسار و سیمای ڕێکوپێکی شیعرەکانی شاعیر داوە.

## ناوەڕۆك لە شیعرەکانی سالمدا:

چوار وەرزی تەمەنی شیعری سالم خەزانی خەماوی و گەلاڕێزانی ژیانی کوردە، بیرمەندێکی هەناسە هەڵکێشی ئەبستراکتەری ئاواتەکانی ناخی دەروونیەتی، هزری خاوێن، هۆش و بیرکردنەوە و عەقڵانی بەدیدێکی بەرفراوانی ململانێی ژیان ئاشنا کردووە، فێری ئەوەی کردووە، تەحەدای جەوری قەدر بکات وایکردووە، شیعر یەخەی هونەر بگرێت و بخوازێت ئاوێتەی ببێت... ئالێرەوە، ئاسۆی بەهرەو توانای هونەری شاعیر زیاتر ڕوون ئەبێتەوە.

واتا= مەبەست و ئامانج.

هونەر= بە لەدایکبوونی شێوەکەی دێتەدی.

مەبەست و ئامانجی شیعر لای سالم: (عەشق هەڵاتنی خۆری ئازادی و خۆشەویستی مرۆڤ و سەربەخۆیی خاک) ە. خەڵک و خاکی سلێمانی پانتاییەکی هەستیاری لە هۆش و بیر و هەست و نەستیدا پێبڕاوە... زمانە ڕەوانە پەتیەکەی ڕۆڵی لە هونەری جوانکاری و وشە و بەهێزی واتـادا بینیوە و لە سێ تـەوەری سەرەکیدا شۆڕشێکی فیکری سیاسیی ئەفراندنی ئەدەبیدا بەرپا کردووە:

یەکەم:

بە جورئەت و بروا بە خۆبوونەوە.. ئازادی و مافی کوردی دیاری کردووە و بە شەوقەوە سوورە لەسەر بەدیهێنانی.

دووەم:

فاکتەری بەدیهێنانی مافە زەوتکراوەکانی کورد، بیری نەتەوە پەروەری و هەستی نیشتمانییە.

سێیەم:

ئەو ئازارەیە لە ئەنجامی ڕووخانی ئەمارەتی بابان و زوڵمی جەندرمەی دەوڵەتی عوسمانی و چەوسانەوەی خەڵکی شار و دەربەدەرکردن و ئاوارەبوونی ئەمیرەکانی بابان سەریهەڵداوە و، ئەو زوڵمەی لە سلێمانی ئەکرێت. ڕەگ و ڕیشەی ئازاری سالم لە ناخدا ڕائەتەکێنێ:

**دوور لە خاکی سەری کۆی تۆ سەنەما تـا سەفەریـم**
**لە بەهەشتێکی وەك ئەم شارە لە حاڵی سـەقەریـم**
**گەرچی بە ئەو سیعەتە، ئەم مولکە وەلاکین بێ تۆ**
**دڵـی من تەنـگە بـەقەد دیـدەی نامەردی لەئیم**

ئای لەو عەشقە بێ وێنەی خاک لە وێنەیەکی شیعری سالمدا، مرۆڤ حەیرانی ئەبێت:

**بزانم گەر لە قەبرا بۆی دەمی تیغت، لە خاکم دێ**
**هەتا دەمرم لە دنیا، زەخمی خوێنینم دەوا نـاکەم**

مەگەر ئەوە سالم نەبێت، بۆی عەشقی خاک لەو تێغەی زامداری کردووە، بەرز دەبێتەوە، شەیدایەتی و برینەکەی لاپیرۆزە، چونکە بۆنی خاکی سلێمانی لێ بەرز ئەبێتەوە. شاعیر هەموو مەبەستەکانی عەشق و خۆشەویستی خاکی کوردستانی لا ئەدرەوشێتەوە... ناو هێنانی کوردستان بۆ خۆی دەلالەتێکی هەستیار و ناسکی سەردەمەکەیەتی:

**لە بۆسەی مەشهەدی من، گەر ڕوو ترش کەی**
**بـە لـەزەت هەر وەکو ئـەسکەنجەبینـی**
**وەکیلی خزری، ئـەی خاڵی لەبی یـار**
**لـە گوێی ئاوی حەیاتی جانشینـــی**
**دەکـا تەسخیری دلها، لـەعلی لێوت**
**سلێمان حیشمەت و ساحـیب نگینـــی**
**بەیادی جیهرە، ئەی دڵبەندی تورە**
**لـە کوردستانـە "سالم" تۆ لە چینـی**

سالم مرۆڤێکی نەتەوە پەروەر و نیشتمان پەرست بووە، دوور لە ویستی تاکە کەسی و حەزی خۆی بیری کردۆتەوە و هەڵویستی نواندووە:

سالم لـەو باجەی لە پێناو بیر و هەڵوێستی نەتەوە پەروەریدا ئەیبەخشی، بێ باکە و شانازیشی پێوە ئەکات:

**گەردنی دڵ کەوتە ژێر سـەنگی فیراق و "سـالـم"ە**
**وا لەژێر ئەم کێوەدا، چەند مەحکەمە، چۆن نانەوێ**

ئای لەو عەزمە بەتینەی "سالم" لە ژێر زەبر و قورسایی کێوی ستەمدا نانەوێت، لە ڕووی واتاوە و لایەنی جوانکاری هونەری و مامەڵەی شارەزایانەی، لەگەڵ زماندا خۆی لە لوتکەدا ئەبینێتەوە.. وشەی (سالم) هونەرمەندانە بە شێوازگەرێکی نوێ بەکارهاتووە و ڕەگەز دۆزی تەواوە و بە واتای:

أ- نازناوی خودی شاعیر هاتووە، ئەمە لە شێوەی کلاسیکیدا پەیرەو ئەکرێت، بەتایبەت لە دوا بەیتدا.

ب- (سالم) مەبەست لەوەیە، گەردنی دڵی لە ژێر بەردی دووری لە وڵات کێوی ستەمدایە کەچی ئەو گەردنە بەرزە خۆی گرتووە و نانەوێت!.

یاران:

شیعرەکانی سالم زۆر زۆریان بە بەرەوە هەیە لە هەردوو بواری هونەری شیعریی ناوەڕۆک و واتای قووڵ و هەستی نەتەوە و نیشتمانپەروەری و بەرخوداندا، بە وردی و قووڵی لێیان بکۆڵدرێتەوە، وەلێ بۆ پێشەکییەکی وا، تەنیا بەرکولێک پێشکەش ئەکرێت.



# سێ دەستنووسی دیوانی سالم

## لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا

## چەند شاعیرمان بەناوی (سالم)ەوە هەیە؟



کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

ئەگەر چاو بە مێژووی ئەدەبیاتی هەر وڵاتێکدا بگێڕین، ئەوا زۆرێك لەو وڵاتانە مێژووی ئەدەبیاتی خۆیان نووسیوەتەوە، جا بۆ ئەم مەبەستەش، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ناوی هەر شاعیرێکی گومناو بکەوێتە ناوانەوە، ئەگەر لە مێژووی ئەدەبیاتدا نەبێت و بۆیان ڕوونیش ببێتەوە کە خەڵکی ئەو وڵاتەیە و لەو وڵاتەدا ژیاوە و موڵکی ئەو وڵاتە بێت، ئەوا ناوی دەخرێتە مێژووی ئەدەبیاتەوە، ئەمەش بە بەڵگە دەسەلمێنن.

ئێمەی کورد لە ڕاستیدا تاکو ئێستا مێژوویەکی ئەدەبیاتی تەواوی بێ هەڵە و کەموکورتیمان نییە، هەر بۆیە کاتێك ناوی شاعیرێکی تازە دەکەوێتە ناوانەوە و ژیاننامەی ڕوون نییە و نازانرێت... ئەوا دەبێ دەستەوەسان دانیشیت و چاوەڕوانی خوا بۆکردوویەك بکەیت کە قسەیەکی ڕاستت بە بەڵگەوە پێ بڵێت.

کاتێك باسی هەر شاعیرێك دەکەین، یان ڕوونتر بڵێم کاتێك دەستنووسێك دێتە بەردەست و دەتەوێ لێکۆڵینەوە لە

شیعرەکانی بکەیت و ناو و ژیانی شاعیرەکانیش بە ڕوونی بنووسیت و بڵاوی بکەیتەوە، تووشی دەیان گرفت و نارەحەتی دەبیتەوە، لەم نێوەندەدا کە باسی سالم دەکەین، هێشتا ژیانی ئەو شاعیرەمان بە ڕوونی بۆ ساغ نەکراوەتەوە و ڕوون نییە، هەر یەکە و بەلایەکدا شەنی دەکات، بەهەرحاڵ، لەنێو ئەو دەستنووسانەی بەردەستی مندا سێ دەستنووس هەن شیعرێکی زۆری سالمی تێدایە، دەستنووسی یەکەمیان کە دیومەتەوە، دەستنووسی (سەیید عەلی) ناوێکە، دەستنووسی دووەمیش هی (نەجمەدین مەلا)یە، دەستنووسی سێیەمیش هیچ ناو و ساڵێکی لەسەر نەنووسراوە و نازانرێت کێ نووسیویەتی و ساڵی چەند نووسراوەتەوە.
دەستنووسی ژمارە یەك و دوو، هەموو شیعرەکانی ئەم دەستنووسەم لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە، لەو کتێبەدا باسی ئەو دوو دەستنووسەم بە وردی نووسیوە، وام بە باشزانی لەم بابەتەدا کە بۆ گۆڤاری (ڕۆڤار) ئامادە دەکرێت و ژمارەی گۆڤارەکەش تایبەت کراوە بە سالم، بەشێك لەو نووسینەی ئەوێ هەڵگرم و دووبارە لێرەدا بیخەمە ڕوو:

**دەستنووسی سەیید عەلی:**



«دەستنووسی سەیید عەلی، یەکێکە لە دەستنووسەکانی کتێبخانەی مەجلیسی شورای ئیسلامی ئێران، ژمارەی قەفەسی (٩٧٨٩)ی بۆ دانراوە، لە سەرەوەش دا ژمارەی (٩٩٦٤)ی بۆ دانراوە، ئەم دەستنووسە بریتییە لە (٤٢) لاپەڕە و قەبارەی (١٤×٢٠سم)ە و (٩٤) هۆنراوەی لە خۆ گرتووە.. هەروەها غەزەلەکانی نێو ئەم نووسخەیەی دیوانی سالم تەنیا چەند دانەیەکی کەمی نەبێت کە بڵاونەکراوەتەوە، ئیدی هەمووی بڵاوکراوەتەوە، بەڵام جیاوازی زۆر لە نێوان هەردوو دەقەکەدا هەن.
ئەم دەستنووسە لە لایەن (سەیید عەلی) ناوێکەوە نووسراوەتەوە، نووسخەی نووسینی ئەم ئەدەبدۆستە لە کتێبخانەی مەجلیسی شورادا بریتییە لە دوو دەستنووس، یەکێکیان دیوانی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)یە و ئەوی دییان دیوانی (سالم)ە، لە دیوانەکەی شێخ ڕەزادا هیچ ناوێك و ساڵێك بەدی ناکرێت، بەڵام لە کۆتایی ئەم دەستنووسەیاندا نووسراوە:

تمام شد کلیات سالم جهته سرکار آحمد مختار بگ دام اقباله الی مدیر زمان یارب مبارکش بادا بمنه آمین بدست سید علی.









له گفتوگۆیەکم دا لەگەڵ مامۆستا (حەمه بۆر)ی خۆشەویست له شاری هەولێر و له ماڵەکەی خۆیدا پێی گوتم: «کەمالی» ئەو کاتەی که له شاری هەڵەبجەدا بووە، لەبەر خەتخۆشی و جوانی نووسینی، چەندین کەشکۆڵ و بەیازی بۆ هاوڕێیان و برادەرانی به پاره و خۆڕایی نووسیوەتەوە، ئەو کاته کەمالی باری گوزەرانی خراپ بوو، گرانییەکی زۆریش بڵاوببووەوه له عێراقدا، به تایبەتی له کوردستان....

هەروەها مامۆستا کەمال ڕەئووف موحەممەد له گفتوگۆیەکی دا لەگەڵ کەمالی دەڵێت: ڕۆمانی (چۆن بووم به خانەدان= مەسەلەی ویژدان/ بڵاوکراوەی د. ئیحسان فوئاد: ١٩٧٠/ بەغدا– چاپخانەی ئیرشاد. لاپەڕە– ٦١، دەڵێ: له دەوروبەری ساڵانی ١٩٢٧–١٩٢٨ دا لەلایەن عەلی کەمال باپیرەوە نووسراوەتەوە....

ئەم نووسراوه له لایەن ناوبراوەوە پەراوێزی ژمارە (٩)ی بۆ دانراوه و دەڵێت: گفتار لەم بارەیەوە– تۆمار– نەکرا– بەڵام بەدەم و دوو بۆی گێڕامەوە که خۆی: دۆست و هاوڕێی نزیکی ئەحمەد موختار جاف بووە و خۆی بۆی نووسیوەتەوە... زیاتر وتی: ئەو کەسەی که چیرۆکەکەی له سەر نووسراوەتەوە و مەبەستە_ ئاشکرایه:...؟) و به ئەحمەد موختار جافم وت: باوکم من ئیتر بۆت نانووسمەوە! وتی: بۆچی؟ وتم: ئەترسم له سەر ئەم چیرۆکه بتکوژن. (ئاشکراشه ئەو چیرۆکه کۆتایی پێ نەهاتووە./ ك. ر. م.).

بەپێ ئەم قسه و باسانه و بەپێی ئەو شیعرەی کەمالی له (دیاری کوردستان) دا بڵاوی کردۆتەوە دەڵێت:

حەزرەتی سالم[*1]

لە گورە گورەی شوعەرای کوردان
حەزرەتی عەبدولرەحمان بابان
لەقەبی (سالم)، تەبعی مەوزوونە
شیعری هەر وەک ئاو ڕەوان و ڕوونە
هەر چەند مەعلوومە جەنابی (نالی)
ساحێب شیعرە و دیوان عالی
لێکن وەک (سالم)، ئەشعاری (نالی)
نییە لە لەفز بێگانە خالی
(سالم) ئوستادی شوعەرای کوردە
نەوەی بابانە، فکری زۆر وردە
ئەشعاری عاری، لە عەیب و عارە
خاوەن دیوان، وەللاتیبارە
ئەمە چەند ساڵە من زۆر بێ حاڵم
بۆ کۆکردنەوەی ئەشعاری (سالم)
من گۆی هونەرم، شوکر بردەوە
دیوانی شیعریم وا کۆکردەوە
چەند غەزەلێکی بە دڵ و بە گیان
ئەنێرمە خزمەت (دیاری کوردستان)
بۆ چاپکردنی دیوانی بە دڵ
جوهد ئەکەم، ئەمما فکرێکە باتڵ
خۆم پارەم نییە، بێ پوڵ و ولاتم
هیممەتیش نییە لای هاو ولاتم

بەپێی ئەم هۆنراوەی کەمالی کە لە (دیاری کوردستان)دا بڵاوی کردۆتەوە، دەردەکەوێت ئەم (سەیید عەلی)یە کەمالی بێت (ئەم بۆچوونە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە هەیە، ئەشێت بوترێت: ئەم دەسخەتە هی عەلی کەمال باپیر بێت، بەڵام تا هەنووکە بەو ناوەوە هیچ بەرهەمێکی بڵاونەکردۆتەوە) و بەهاوکاری ئەحمەد موختار بەگی جاف شاعیر نووسیبێتیەوە و دواتر ویستبێتی دیوانەکەی چاپ بکات، هەروەها (هوما) خانیش کە لە نەوەی «کەمالی»-ی شاعیری خۆشەویستە و ڕووخسەتی چاپکردنی بەرهەمەکانی (کەمالی)م لێ وەرگرتووە و هاوکاری تەواوی کردووم، لەو بارەوە وتی: کەمالی لە دوادواییەکانی ژیانی دا کە چاوی لە دەستدا بوو، من شیعرەکانیم بۆ دەنووسییەوە، خاوەنی کتێبخانەیەکی باش بوو، بەڵام دوای ئەوەی دایکم و بنەماڵەکەمان هەموویان چوون بۆ دەرەوەی وڵات، منیش لە بەغدا بووم، دایکم کتێبخانەکەی دابووە لای دراوسێیەکمان، بەڵام ئەو دراوسێیەمان نازانم کێ بووە؟! بۆیە هەموو شتەکانی کەمالی فەوتاون، کەواتە: دەبێ بەپێی ئەم سەرچاوانەی باسمان کردن، ئەم (دیوانی سالم و دیوانی شێخ ڕەزا)یە هی کەمالی بن و کەوتبنە دەرەوەی وڵات، کەمالی-یش ناوی تەواوی عەلی کوڕی باپیر ئاغایە، باپیر ئاغا کوڕی چراغە و چراغیش کوڕی جوامێرە، سەرۆکی هۆزی سمایل عوزێریی بووە، هەر لە کۆنەوە باپیر ئاغا لە زەمانی عوسمانییەکاندا زابتی تورکەکان بووە. لەو زەمانەدا کۆچی دوایی کردووە و شەش مانگ پێش کۆچی دوایی کاک ئەحمەدی شێخ، واتە: لە ساڵی (١٣٠٥)ی کۆچیدا هاتووەتە دنیاوە، هەروەها کاک ئەحمەدی شێخ گرتوویەتییە باوەشییەوە و دوعای بۆ نووسیووە.

دەبێ لە کۆتاییشدا ئەم چەند وتەیە بڵێم: ئەم دەستنووسە لە ڕووی تەمەنەوە زۆر کۆن نییە و دەبێ هەر (٩٠-٩٥)

١ (*) عەلی کەمال باپیر: گۆڤاری دیاری کوردستان، ژمارە (٢٧)ی ١٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥.

ساڵێك تەمەنی بێت، چونکە بە لاپەڕەکانییەوە دیارە کە زۆر کۆن نییە...

هەرچی لەبارەی دەستنووسی دووەمیشەوە قسانێك بکەین، ئەوا دەبێ باس لە خزمەتە گەورەکەی مامۆستا نەجمەدین مەلا بە گرنگ و بایەخەوە بکەین و بکرێت...

## دەستنووسی نەجمەدین مەلا:


(١٣٢)

عبدالرحمان بگ سالم وسەرگوزەشتەی ژیانی

سالم ناوی عبدالرحمان بەگە کوری محمد بگی قرە جهنم کوری احمد بگی صاحبقرانە و آموزای مصطفی بگی
کوردی یە الیی لە پێشا سالم لقبی رەنجور و یکی الی بیمار بووە گوایە لە سەر تکلیفی
دوکتور لقبەکەی گۆریوە کردویە بە [سالم] کە نیشانەی ساغ و سلیمی بێ چونکە
سالم پیاوێکی لاواز بێ تاقەت ماتوم لول و بێ دەنگ بووە و قنگەکیش بووە
دکو خزمە ... الیی سالم لە سالی [١٢٢٠] ﻫ لە دایک بووە و لە سالی ١٢٨٦ هجری
خوای کردووە،
بۆ چینەی هۆزی سالم کە بە صاحبقران بەناون لە کوردستانی ایرانا بووە، فامیلیا = خێزانی
سالم لەگەڵ سالم دا اغلب احیون بۆ ایران بۆ سەردانی خزمە... نیات بەلام
لە پاشی روخانی حکومتی بابان لەگەڵ خێزانەکەیا احینە ایران و لە [طهران = تاران]
زۆر اینینەوە سالم دەرس و بیزار ابێ لە تاران بەم دو بێتە بیانی ابکا:

لەگەڵ دل شرطمە سالم گەر نجاتم بێ لە تاران نا — بهشت ار بێتە دەشتی رەی بە ایرانا گوزەر ناکەم
خۆزگە ام زانی لە تاران نا نجاتم کەی ابێ — کوێ یارم مشهدە یا منزلم هەرەی ابێ

سالم دایکی کچی سلیمان آغای الیاس آغایە، و پورێکی بووە ناوی [تەحان] بووە شاعرەیکی
بە ناوبانگ و خاوەن زەوق بووە،
دکو الیی سالم لە سلیمانی وفاتی کردووە [١] و لای قبری مصطفی بگی کوردی یەوە نێژراوە
[بە دیوانی]

[١] لە پاشی روخانی حکومتی بابان [سالم] بە مأموریت لە لای حکومتی تورکەوە نێردراوە
بۆ شاری [حلە] چەند زەمانێک لەوی رای بواردووە و لەوێشی وفاتی کردووە
و هەڵبەستێکی دور و درێژیشی لەوێ وتووە کە لەم کتبەدا لە ... نوسراوە گلەیی
لە مالە عارەبێک کردووە کە چوتە مالیان و خزمتیان نەکردووە

دیوانی سالم لە شاری بغداد لە لایی محمد طاهری مریوانی لە سالی ١٩٢٢ م چاپکراوە
بێ جگە لەوەی کە چاپکراوە گەلێ هەڵبەستی شیرین و غرامی، و تاییبەتیشی هیە کە داخلی
او دیوانە چاپکراوە نەکراوە ایمە او هەڵبەستانەم لەم دفترەدا نوسی بە نیشانەی [بچ، ن]
مامۆستا: نجم الدین ملا سلیمانی — ١٩ — ٤ — ١٩٤٠ م



### لاپەڕەی ١٣٢ی دەستنووسی نەجمەدین مەلا زیاتر لە ٩٠ پارچە شیعری لە خۆ گرتووە

مامۆستا نەجمەدین مەلا، یەکێکە لەو مامۆستا و دەست ڕەنگین و کەشکۆڵنووس و ڕۆژنامەگەر و چیرۆکنووس و... ەی کە لە ئەدەبیاتی کوردی سەردەمی خۆیدا دەورێکی گرنگ و کۆکەرەوەیەکی گرنگی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیی بووە لەگەڵ شاعیر و ڕۆژنامەوان پیرەمێردی نەمردا، مامۆستا نەجمەدین مەلا لە ڕۆژنامەی ژین و ژیان و ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە پیرەمێردی نەمر دەریدەکردن، بەرهەمی خۆی بڵاوکردۆتەوە...

نەجمەدین مەلا بەهاوکاری پیرەمێرد، یان باشترە بڵێین ئەم دوو دەست ڕەنگینە شان بەشانی یەکتری کاریان کردووە، مامۆستا نەجمەدین مەلا هەرچی هۆنراوە و داستان و شیعر و چیرۆکی دەستکەوتبێ، ئەگەر بڵاوی نەکردبێتەوە لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی خۆیدا، ئەوا لە کەشکۆڵەکانی لای خۆیدا نووسونیەتیەوە، هەندێکجاریش ئەو غەزەل و سەرگوزەشتە و شیعرانەی کە بڵاویشی دەکردەوە، هەر لە کەشکۆڵەکانی خۆیدا دەینووسییەوە. بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە لە کەشکۆڵی مینای شکستە و نووسراوی پەرێشاندا بەروونی دیار و ئاشکرایە.

هەندێك لە نووسەران (نووسراوی پەرێشان و مینای شکستە) هەر بەیەك سەرچاوە لە قەڵەمی دەدەن و دەڵێن: مینای شکستە سێ بەرگە، من تاکو ئێستا چەند کەشکۆڵێکی مامۆستا نەجمەدین مەلام لە ڕێگەی بنکەی ژینەوە دەستکەوتووە، لەم دوایانەدا مامۆستا ڕەفیق ساڵحی خۆشەویست، نزیکەی ١٠ کەشکۆڵی نەجمەدین مەلای خستە بەردەستم، هەموویانم پشکنی و ڕوانیم شتانێکی گرنگن و پێویستە ئاوڕێك لە بەرهەمەکانی ئەم مامۆستایە بدرێتەوە، چونکە مامۆستا خزمەتی زۆری ئەدەبیاتی کوردی کردووە، ئەمەش جێگای سوپاسە و پێویستە ئێمەیش نرخ و سوودی

ئەو بەرهەمانە بخەینە ڕوو و بە چاوێکی ڕێزەوە تەماشایان بکەین، ئەگەرچی هەندێ کەموکورتی تێدایە...

بەرگی یەکەم و سێیەمی مینای شکستە و نووسراوی پەرێشان کە کاتی خۆی لەلای مامۆستا حەمەبۆر بووە، ئێستا لە بنکەی ژینە، من تەواوی ئەو کەشکۆڵانەم لە بنکەی ژین وەرگرتووە لەگەڵ کەشکۆڵی (سۆزی نیشتمان) کە یەکێکی ترە لە بەرهەمەکانی مامۆستا نەجمەدین مەلا.

لە دوو بەرگی مینای شکستە و نووسراوی پەرێشاندا نزیکەی ۹۸ پارچە شیعر هەیە، هەندێکیان لە دیوانەکەی سالمدا بڵاوکراوەتەوە و هەندێکی تریان بڵاونەکراوەتەوە، هەندێکی تریان تاک و تەرا لە گۆڤار و ناملیکەی تریدا هاتوون، کاکەی فەلاحیش لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا لە ژمارە (٢٦–٣٤)دا هەندێك لەو شیعرانەی نەجمەدین مەلا و پیرەمێرد دەستیان کەوتووە و لە پەراوێزی دیوانەکەی (کوردی و مەریوانی) دا نووسیویانە، بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام باسی پیرەمێرد و نەجمەدین مەلای نەکردووە، دیارە ئەو نووسخەیەی کەوتۆتە دەستی ناوی کەسی لەسەر نەنووسراوە، بەڵام د. مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردیی دا ئاماژەی پێ داوە.[21]

هەندێکی کەمی ئەو شیعرانەی کە نەجمەدین مەلا لە کەشکۆڵەکانیدا نووسیویەتییەوە لەگەڵ نووسخەکەی سەیید عەلی دا یەکێکن و جیاوازی وشەیی تێدایە، بەڕاستی ئەو شیعرانەی نەجمەدین مەلا کۆی کردووەتەوە بە کەڵکن و جێگای بایەخە بۆ بەراورد و لێکۆڵینەوە و ڕێکخستنەوەی دیوانی سالم.

نەجمەدین مەلا لە بەرگی یەکەمی مینای شکستەدا لە لاپەڕە (١٣٢)ەوە کورتەیەکی لە باسی ژیانی سالم نووسیوە، دواتر نزیکەی ٩٤ غەزەل و قەسیدەی بڵاوکراوە و بڵاونەکراوەی نووسیوەتەوە، لە کۆتایی ژیانی سالمدا دەڵێت: دیوانی سالم لە شاری بەغدا لە لایەن موحەممەد تاهری مەریوانی لە ساڵی (١٩٣٣م) چاپکراوە، بێجگە لەوەی کە چاپکراوە، گەلێ هەڵبەستی شیرین غەرامی، و تەئریخیش هەیە کە داخلی ئەو دیوانە چاپکراوە نەکراوە، ئێمە ئەو هەڵبەستانە لەم دەفتەرەدا ئەنووسین بە نیشانەی (چ، ن)، ١٩–٤–١٩٤٠م مامۆستا: نەجمەدین مەلا– سلێمانی.

ئەڵبەتە ئەگەر تەماشایەکی ئەم چەند دێڕەی مامۆستای ناوبراو بکەین، دەبینین مامۆستامان دەڵێت: (ئێمە)، کەواتە: دەبێ ئەو کەسەی دیی پیرەمێرد بێت، لە پەراوێزی قەسیدەی (خاڵە بێ تۆمە..)ی سالمدا، قەسیدەیەکە سالم لەگەڵ مەلا موئمینی جافدا وتویەتی دەڵێت: ((مەلا مومن= مەلا موئمین))، ئەم زاتە جافە لە چاخی خۆیدا مامۆستای مەرحووم (مەحموود پاشا)ی جاف بووە و لە چاخی (عەبدولڕەحمان بەگی سالم) زیندەگانی کردووە، بەشی زۆری ئەشعاری سالم (مەلا مومن) کۆی کردووەتەوە و دەست مەحموود پاشا کەوتووە.

* زۆری ئەشعاری سالم کە لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نییە، لە کەشکۆڵێك وەرمگرتووە کە مەحموود پاشای جاف بە خەتی خۆی نووسیویەتییەوە، ئێستە ئەو کەشکۆڵە لای جەنابی مودیری جەریدەی ژین حاجی تۆفیق بەگە، نەجمەدین مەلا، ٢٤–٤– ١٩٤٠.

بەپێی ئەم قسانەی نەجمەدین مەلا من نووسخەیەکی کەشکۆڵی مەحموود پاشای جافم بە سیدی لە بەڕێز کاك مەحموود هۆشمەند وەرگرتووە، لەگەڵ ئەو کۆپییەی کە کاك مەحموود هۆشمەند داویەتیيە کاکە حەمەی مەلا کەریم، ئەو شیعرانەی کە مامۆستا نەجمەدین مەلا باسیان دەکات، ئەوە نین، تەنها چەند پارچە شیعرێکی کەمن، وادەزانم مەحموود پاشا لە دوو دەستنووس زیاتری هەبێت، یەکێکیان شیعری سالمی زۆری تێدا بووە، یان ئەوەتا ئەو کەشکۆڵەی کە ئێستە کۆپییەکی لەلای منە دەبێ هەندێکی فەوتا بێت!!

لە کۆتایی شیعرەکانی سالم بە دەستنووسی نەجمەدین مەلا، نووسراوە: بە کۆمەکی یەزدان، هەڵبژاردەی دیوانی سالم تەواو بوو بە قەڵەمی بەندەی بێ نەوا، مامۆستا: نەجمەدین مەلا، لە شاری سلێمانی لە شەوی پێنج شەممەی ١٨ی ڕەبیعولئەوەلی ١٣٥٩ھ، ڕێکەوتی (٢٥)ی نیسانی ١٩٤٠م، هیوام وایە خوێندەواران لە نارێکی نووسینەکەم ببوورن، چونکە لە وەختێکی پەرێشانی و بێ زەوقی دا نووسیومەتەوە.

ئەم دەستنووسانەی نەجمەدین مەلا لە دەفتەرێکی گەورەدا نووسراوەتەوە، دەفتەرەکانیش خەتدارن و بەخەتێکی خۆش نووسراوەتەوە، شێوەی ڕێنووسی کۆن و نوێی تێکەڵ کردووە، لە هەڵە بەدەر نییە، بەڵام جێگەی بایەخە...

زیادی و کەمی لە بەیت و نووسینەکاندا هەیە، بۆیە بەگرنگی دەزانم کە بڵاوی بکەمەوە و لە دیوانی سالمدا جێگەی خۆی بگرێت، هیوادارم کاکە حەمەی مەلا کەریمیش تەنها پشت بەو نووسخەیەی ڕووسیا نەبەستێت کە دەستی کەوتووە، چونکە هەندێك شیعر هەن لە کەشکۆڵێکدا لەوانەیە لەو کەشکۆڵەدا نەبن».

---

٢ (١) مێژووی ئەدەبی کوردی: د. مارف خەزنەدار، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، لاپەڕە (١١٩- ١٢١).

- تێبینی: لە بارەی ئەو شیعرانەی کە کاکەی فەلاح لە گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ)ی ژمارە (٢٦-٣٤)ی ساڵانی ١٩٧٤)ەوە بڵاوی کردۆتەوە، چەند وتەیەکم لە پەراوێزی قەسیدەی (ئەکا "دەکا" دنیای پڕ شۆڕش...)ەوە کردووە، ئەوەم درکاندووە کە ئەو شیعرانەی کاکەی فەلاح بڵاوی کردۆتەوە، ئەو شیعرانەن کە پیرەمێرد لە پەراوێزی دیوانە چاپکراوەکەی سالم دا نووسیویەتییەوە کە لە ساڵی ١٩٣٣ دا کوردی و مەریوانی بەچاپیان گەیاندووە.

**کۆتایی پارچە شیعرەکان لە مینای شکستە، زیاتر لە ٩٠ پارچە شیعرە**



**دیسانەوە دەستنووسی نەجمەدین مەلایە**



**بەرگەکانی تری مینای شکستەی نەجمەدین مەلا**



**دەستنووسی ژمارە سێ:**





ئەم دەستنووسەش یەکێکی دییە لەو دەستنووسانەی کە بەدەستم هێناوە، دەستنووسەکە ناوی هیچ کەس و شوێنێکی نە لە سەرەتاوە و نە لە کۆتاییەوە پێوە نییە، بەرگی ئەم دەستنووسە ڕەشێکی تۆخی فسفۆری خۆی دەنووێنێت، قەبارەی دەستنووسەکە (١٩×٢٩سم)ە، کۆی لاپەڕەکانی ئەم دەستنووسە (٦٩٠) لاپەڕەیە، بەخەتی شکستە نووسراوە، چوارچێوە بۆ هەموو لاپەڕەکانی ئەم دەستنووسە کراوە. ناوی هەر هۆنراوەیەك کە لە سەرەتاوە نووسرابێت، بە خەتی سوور نووسراوە.

لاپــەڕەی یەکەم و دووەمــی سەرەتای دەستنووسەکە هیچی تێدا نەنووسراوە و بە سپێتی هێڵراوەتەوە، لاپــەڕەی سێهەمیش بە نەخش و نیگارێکی جوان، بە مەرەکەبی شین و زەردی ئاڵتوونی ڕازاوەتــەوە، دوای ئەوە بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست بەنووسینەوەی شیعرەکانی سالم دەکات.

سەرەتای یەکەم هۆنراوەی سالم لە دەستنووسەکەدا ئەم هۆنراوەیە:

**آلهي خــاطري بي آرزوده**
**حبابم را بدريا شست و شوده**
**زباني بخش خاموشي پرستار**
**نشسته در كمين صيد اسرار**

ئەم هۆنراوانەی سالم کە لەم دەستنووسەدا هاتوون، هەمەچەشنن، وەکو زانراوە تاکو ئێستا سالم هۆنراوەی ئایینی نەبووە، بەڵام ئەم دەستنووسە هۆنراوەی ئایینی زۆری تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ چوارینەی تێدایە، هەروەها لە کۆتایی هەندێك هۆنراوەدا ئاماژەی بە ساڵ کردووە بەپێی حرووفی ئەبجەدی...

هۆنراوەی کۆتایی دەستنووسەکە ئەم هۆنراوەیە:

**بحمدالله كه شد نور شفا ديد**
**زا نوار حضور ظل معبود**
**محيط شاه شد انفاس پاكش**
**اثر پيش دعا آمد كه هان زود**
**بحكم عدل ظل الله عادل**
**مرض را از جهان اخراج فرمود**
**خضر آمد مبارك باد گويان**
**كه عمر دولت جاويد افزود**
**سروش اين مصرع تاريخ برخواند**
**شفاى شد دعاى پادشه بود**

بەپێی حـروفی ئـەبجـەدی ئـەم نیوە بەیتەی دووەمـی هۆنراوەکە دەکاتە:

شفاى= ٣٠٠+٨٠+١+١٠= ٣٩١

شد= ٣٠٠+٤= ٣٠٤

دعاى= ٤+٧٠+١+١٠= ٨٥

پادشه= ٢+١+٣٠٠+٥= ٣٠٨

بود= ٢+٦+٤= ١٢

٣٩١+٣٠٤+٨٥+٣٠٨+١٢= ١١٠٠

هاتنی ئەم ساڵە نازانم مەبەستی لە چییە و بۆچی سالم هێناویەتی، هـیوادارم ئەمەش ڕۆژێـك لە ڕۆژان ساغ ببێتەوە. دوای ئەم هۆنراوە، پێنج لاپەڕەی سپی هیچی تێدا نەنووسراوە– دێت، دوابـەدوای ئەمە کۆتایی بە دەستنووسەکە دێت، نە ناوی نووسەر و نە ساڵ... لە کۆتایی دەستنووسەکەدا نەنووسراوە. بەو هیوایەم ئەم هۆنراوانەی سالمیش ڕۆژێك لە ڕۆژان ساغ ببێتەوە، ئەگەر سالمی ساحێبقڕانە یان سالمێکی دیکەیە.



# غوربەت و ڕەنگدانەوە لە شیعرەکانی (سالم)دا



**ناز ئەحمەد سەعید**

**خوێندکاری دکتۆرای ئەدەب – زانکۆی سلێمانی**

هەرچەندە تا ئێستا سەرجەم شیعرەکانی (سالم) و پوختەی ژیانی لە دیوانێکی شایستە بەخۆی کۆنەکراوەتەوە، ئەوەی هەیە، چاپە کۆنەکانی مامۆستا گیو موکریانی و کوردی و مەریوانییە، لەم ساڵانەی دواییشدا لێرە و لەوێ چەند پارچە شیعرێکی دیکەی دۆزرانـــەوە و بەجیا چاپکران، مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم- یش زۆر دەمێکە سەرقاڵی کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و دووبارە چاپکردنەوەی دیوانی (سالم) ە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا نەکەوتۆتە بەر دەستی خوێنەران. بۆیە کە دەمانەوێت بـاس لە(سالم) و شیعرەکانی بکەین، پشت بـەو سـەرچـاوە کەمانە دەبەستین کە ئێستا لەبەردەستدایە. ئاشکرایە (سالم) یەکێک بـووە لەو سێ شاعیرەی کە بەدامەزرێنەری شیعری کلاسیکی کوردی کرمانجی خـواروو دادەنرێن لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا (نالی، سالم، کوردی)، ئەو سێکوچکەیەی کە هاوڕێی و هاوتەمەنی یەکبوون، خزمەتێکی یەکجار زۆری زمانی کوردییان کرد، ئەوەی ئێمە لێرەدا زۆر مەبەستمانە و تیشکی دەخەینە سەر، لایەنی ئاوارەبوون و دەربەدەری (سالم) ە و ڕەنگدانەوەی ئەم ڕووداوانەیە لە شیعرەکانیدا، (سالم) بەچاوی خۆی ڕووخانی میرنشینی بابان و قەتڵ و عامی کوردەکان لەلایەن تورکەکانەوە دەبینێت،

داگیرکردنی شاری سلێمانی و پشێوی شار و وڵات و نەهامەتی خەڵک هەر لە کرێکارێکەوە تا دەگاتە ڕۆشنبیر و خاوەن هونەر و ئەدەب و کەسایەتییە ناسراوەکان کزە لە جەرگی دێنێ، بەجۆرێ نائومێدی باڵ بەسەر ژیانیدا دەکێشێت و خۆشی و زەردەخەنەی لێ ون دەکەن، چونکە لەناو جەرگەی شەڕدا بووە، بینیویەتی شار چۆن سەروژێر کراوە، هیچ شتێ، هیچ کەسێ، لە شوێنی خۆی نەماوە، هەموو شت خاپوورە، شار بۆنی خوێن و خەمی لێ دێت، بۆیە دەتوانین بڵێین لێرەوە غوربەت و دابڕانی دەستپێدەکات، کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

سەرەتا باس لە وشەی (غوربەت) دەکەین و پاشان لە شێوەکانی غوربەت دەدوێین لای سالم، سەرەڕای دەوڵەمەندیی شاعیر لەم بوارەدا، ئێمە تەنیا ئاماژە بە چەند نموونەیەکی شیعری دەدەین.

**غوربەت:** لە بنەچەدا لە(الغربە)ی عەرەبییەوە هاتووە، لە عەرەبیشدا بەچەندین جۆر لێکدراوەتەوە، بەگشتی دەڵێن: لە (غرب) هاتووە، واتە ئاوابوون، دوورکەوتنەوە، ونبوون .....، (الغربە) ش، واتە دوورکەوتنەوە لە وڵات، یان لە زێد، یان دوورکەوتنەوە لە خێزان و خزم و کەسوکار، لە کوردیشدا هەندێجار (ئاوارەیی) (نامۆیی) لە شوێنی (غوربەت) بەکاردەهێنرێت، لە زمانی ئینگلیزیشدا (Alienation)و (Homelessness)ی بۆ بەکاردەهێنن.

## شێوەکانی غوربەت لە لای سالم:

بێگومان جۆر و شێوەکانی غوربەت زۆرن وەکو غوربەتی (دەروونی، شوێنی، کۆمەڵایەتی، ئاینی، زەمەنی، سیاسی..) ئەمە و لەگەڵ ئەوەشدا بەیەکداچوون و تێکەڵاوییش لە نێوان جۆرەکاندا هەیە، لە لایەک بەهۆی پەیوەندی و نزیکییان لە یەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە تەواوکەری یەکترن، بۆیە زۆرجار کە باسی جۆرێکیان دەکەین، ڕاستەوخۆبێت یان لا بەلا، دەچینە ناو جۆرێکی دیکەیانەوە.

لەگەڵ ئەوەی چەمکی (غوربەت) فراوان و هەمەجۆرە، بیروڕای فەیلەسوف و ڕووناکبیرەکانیش لەم ڕووەوە جیاوازە، بەڵام هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە، کەسی غەریب و نامۆ بە دەست نارێکی دەروونییەوە دەناڵێنێت، ناتوانێت خۆی لەگەڵ کۆمەڵدا بگونجێنێت، هەست بە ونبوون و زوڵم و ستەم دەکات، و تووشی هەر جۆرێکی غوربەت بێت ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوە لەسەر هەست و دەروونی دروست دەکات.

## یەکەم: غوربەتی دەروونی(نفسی)

هەرچەندە ئەم شێوەیەی غوربەت پەیوەستە بە هەموو شێوە و جۆرەکانی دیکەی غوربەتەوە، جا سیاسی بێت، یان ڕۆشنبیری ...هتد، بۆیە گرانە بتوانین بە تەواوی جیای بکەینەوە، بەڵام ئێمە مەبەستمانە بۆ دەرخستنی غوربەتێک کە لەناو وڵات و شاری خۆیدایە، وا ناوی بنێین، ئەشتوانرێت بە غوربەتی کۆمەڵایەتی ناوبەرین.

لێرەدا شاعیر لەو شوێن و جێگایەی تیا دەژی دوورنەکەوتۆتەوە، ئاوارەی هیچ وڵات و جێیەکی دیکە نەبووە، هەر لەناو وڵات و شاری خۆیدا دەژی، بەڵام بەهۆی تێکچوونی بارودۆخی وڵات لە ڕووی سیاسی، یان ڕۆشنبیرییەوە، شاعیر تووشی هەڵچوونی دەروونی و هۆشەکی دەبێت، ناتوانێت یان نایەوێت پەیوەندی لەگەڵ خەڵک و دەورووبەریدا دروست بکات، گۆشەگیر دەوەستێت، هەست بەنائارامی و دڵەڕاوکێ دەکات، بەهۆی ئەو بارودۆخە ناهەموار و نەخوازراوەی تیا دەژی، خۆی لە خەڵک بەدوور دەگرێت بۆ ئەوەی لەو واقیعە ڕابکات، چونکە زۆر بێهزە بەرامبەری و لە توانایدا نییە بیگۆڕێت، زۆرجار باس لە یادگاری و بیرەوەرییەکانی پێشووی دەکاتەوە، خۆزگە بەو کات و ساتانە دەخوازێت، (سالم) لە سەردەمی میرنشینی باباندا ژیاوە، ئەو بەحوکمی ئەوەی لە بنەماڵەیەکی ناودار و لاوچاک و چەکمە ڕق بووە، کە (بنەماڵەی ساحێبقران)ە، هەروەها شێری میرنشینی بابان (عەزیزبەگی بابان) هاوڕێی نزیکی بووە، لە سەردەمی بابانیەکاندا بارودۆخی شارەکە بەگشتی و وەزعی (سالم) بەتایبەتی زۆر باش و جێگیربووە، بەجۆرێک بابانییەکان زۆر گرنگییان بە خوێندن و ڕۆشنبیری دەدا، وڵات و شار لە زۆر لایەنەوە پێشکەوتنی بەخۆوە دی، بەڵام بە ڕووخان و لەناو چوونی بابانییەکان هەموو شتەکان سەراوژێر دەبنەوە، تورکەکان وڵات داگیر دەکەن، پیاوماقوڵان هەندێکیان کوژران، هەندێکی دیکەیان بەندکران، ئەوەشی مایەوە دوورخرایەوە و مەنفاکران، کەواتە: با لەناو شار و وڵاتی خۆشیدا بێت، بەڵام سالم غەریبە، کەسی نەماوە، هاوڕێ و هاوخەمەکانی تیاچوون، سالم گۆشەگیری دەخوازێت لە ناخیدا هەست بەغوربەت و ئاوارەیی دەکات، چونکە دوورە لە ئاشنا و هاودەمەکانی، بۆیە دەڵێت:

**لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستە ئەژنۆ کەف زەنان**
**گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان**

ئەوەتا شاعیر هەرچەندە لە شار و وڵاتی خۆیدایە، بەڵام هەست بەگۆشەگیری و غوربەت دەکات، چونکە لای ئەو، ئەو نەهامەتی و هێرش و داگیرکردنەی تورکەکان وەکو گێژەڵووکەیەک وایە هەموو دنیای لەبەرچاو تاریک کردن. ئەمەیە غوربەت، ئەمەیە ئاوارەبوون، ئەمەیە دوورکەوتنەوە لە خۆشییەکان، لە ئاسودەیی، لە هیواکان، لە خودی پرئومێد .

**دڵ لە میحنەت کەیلە سەیری ناوشارم نییە**
**عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لە داغی مەردومان**

دڵ و دەروونی شاعیر پڕە لە نەهامەتی و ناسۆری ژیان، چاوی خوێنی تێزاوە لەداغی خراپەکاری، شار بەجۆرێک کاولکراوە، سالم چاوی بەرایی نایەت، سەیری ناوشار بکات، داخێکی چەند گرانە و نەشتوانیت هیچ کارێک بکەیت و هەر ناخی خۆت بخۆیتەوە، چونکە هیچی لە دەست نایەت بەرامبەر تورکە داگیرکەرەکان بیکات.

**(سالم) صفەت لە بێ کەسیا با نەبێ هیلاك**
**من کردم ئەو نەکا لەغەما خوێنی خۆی هەدەر**

لێرەدا لە وەڵامی پرسیارەکەی (نالی) کە لە نامەکەیدا دەپرسێت بگەڕێتەوە بۆ شار و وڵات یان نا، (سالم) ئامۆژگاری دەکات، کە نەگەڕێتەوە، چونکە لە غەم و خەفەت و دەردا خوێنی خۆی بەخۆڕایی و بە فیڕۆ دەڕوات، با وەکو سالم لە خۆی نەکات کە بێکەس و بێ هاوەڵە و زۆر ماندوو و هیلاکە و خوێنیشی هەروا بە هەدەر و بەخۆڕایی دەڕوات، ئەمە هەرچەندە سالم لەناو وڵات و شاری خۆیدا دەژی، کەچی هەست بە بێکەسی و غەریبی و نامۆیی دەکات، ئەمەش بەهۆی نەگونجان و ڕازی نەبوونە بە سیاسەت و حوکمڕانی تورکەکانی ئەو کاتە، بۆیە کار لە هەست و دەروونی دەکات، هەست بە بێکەسی و بێ هاوەڵی دەکات.

## دووەم : غوربەتی کاتی (زەمەنی)

سالم زۆر خەمبارە، پێی درێغ و حەیفە لەجێی سلێمان و بابانیەکان، ڕۆم حوکمی شار دەکات، مۆر و دەسەڵاتی سلێمان کەوتە دەستی دێوێکی سووک و نزم و بێ نرخ، دوور کەوتنەوە و دابڕان لە بابانییەکان و سەرکردەکانیان کە ئاشنا و هاوڕێی سالم و حاکمی وڵات بوون، غوربەت و ئاوارەبوونی بۆ سالم دروستکردووە، ئەمە سەرباری ئەوەی، ئەوانەی شوێنیان گرتوونەتەوە خوێن ڕێژ و پیاو کوژ و خانە وێرانکەرن، ئەمە غوربەتی کاتی (زەمەنی) بۆ سالم دروست کردبوو، چونکە ئاواتەخوازە و بیری ئەو زەمەن و کاتەی بابانییەکانی دەکرد، کە حوکمڕانییان دەکرد، سالم لەم زەمەنەدا غەریبە ئەوەتا دەڵێت:

**حاکمە ڕۆمی لەسەر تەختی (سلێمانی) دریغ**
**کەوتە دەستی دێوی دوون موهری سلێمان ئەلئەمان**

یان هەر لە چامەکەی کە وەڵامی (نالی) هاوڕێی دەداتەوە و باسی زەمەنی پێشوو دەکات کە (کانی ئاسکان) چۆن خۆش بووە و شوێنی کۆبوونەوەی ئاسکەکان بووە، ئێستا لەم سەردەم و کاتەدا، لەتاو زوڵم و ستەم و دەسەڵاتی ڕۆمەکان بۆتە شوێنی گوێدرێژەکان، ئەوەتا هەست بە غەریبی دەکات و بیری ئەو زەمەن و سەردەمە دەکات، تەنانەت گیاندارەکانیش بێزار و زەرەرمەند بوون لەم داگیرکردنە.

**ئەوسا مەکانی ئاسکە بوو (کانی ئاسکان)**
**ئێستە لە دەنگ و نعرەیی ڕۆمی پڕە لە کەر**

لەم دێڕەشدا باس لەوە دەکات کە بەهۆی نەمانی میرنشینی بابانەوە، دووری وڵات لەو حاکم و فەرمانڕەوایانەوە، کەس شێوە و ڕووخساری هونەری نەدیوە، واتە لەلایەنی ئەدەبی و هونەریشەوە شار بەرەو دواوە گەڕاوەتەوە، کە دەڵێت:

**لەو ساڵەوە حاکمانی بەبە دەربەدەر کران**
**نەیدیوە کەس لە چەهرەی کەس جەوهەری هونەر**

## سێیەم: غوربەتی شوێنی(مکانی)

واتە دوورکەوتنەوە، دابڕان، لە وڵات و خاک و نیشتمانی خۆت، لە خێزان و خزم و کەس و کار، جا بە زۆرەملێ بێت و ناچار بکرێت شوێنەکە جێ بهێڵێت، کە هەندێجار ئەمە دەگاتە ڕادەی (نفی) کەسەکە، واتە لە شوێنە غەریبەکەش دەست بەسەر دەبێت و ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی بجوڵێتەوە، یان بە ئارەزووی خودی کەسەکە دەبێت، کە لەلایەنی سیاسی، یان ئابوری، یان کۆمەڵایەتی، شوێنەکەی بەدڵ نییە و لەگەڵیدا ناگونجێت و ناڕازییە و کۆچ دەکات بۆ جێیەکی دیکە، بە زۆری نالەباری و ناهەمواری سیاسەتی وڵات وا دەکات ڕێگەی کۆچ بگرنە بەر.

سالم پاش ڕووخانی میرنشینی بابان و هاتنی تورکەکان و داگیرکردنی شار و وڵات و خاپوورکردنی هەموو جێیەکی شار، ئاو و هەوای شار بۆنی خوێن و خەمی لێ دەهات، بۆیە ناتوانێت چیتر ئەو دیمەنە جەرگبڕانە ببینێت، ناچار ڕوودەکاتە وڵاتی ئێران بۆ لای هەندێ



له خزم و کەسەکانی ئەویی، و دەڵێت:

**له زوڵمی چەرخی چەپگەردیش درێغا حسرەتا دادا**
**بە میسلی سالمی بێکەس گەلێ کەس وێڵی شارانن**

ئەوەتا له تاو زوڵم و ستەم، شار و وڵات بەجێ دێڵێ، نەک هەر سالم ئاوارە و بێکەسە، بەڵکو زۆر کەسی تریش بە وێنەی سالم ئاوارەبوون.

له شیعرێکی دیکەدا کە پێنج خشتەکییە لەسەر هەڵبەستێکی مەولاناخالد، سالم دەڵێت:

**دڵ له میحنەت کەیله ڕێم کەن بەڵکوو زوو دەرچم له شار**
**ئیمڕۆ ڕۆژێکە له جەمعی مەردوومان بگرم کەنار**
**دەستەو ئەژنۆ دانیشم بێ چارە و زار و نزار**
**ڕۆژی جەژنە من تەریك و بێ بەشی دیداری یار**
**خەڵکی (خوڕەم ) و من بەخوڕرەم ئاو له چاوم دێتە خوار**

سالم دڵی پڕە له میحنەت و خەم و پەژارە، داوا دەکات وازی لێ بێنن، ڕێگەی لێ نەگرن شار بەجێ بهێڵێت، ئەیەوێت بە تەنیا بژی و خۆی له هەموو خەڵک دووربخاتەوە، کەنارگیر بێت.

**کەس نەبێ سالم له دونیادا وەکوو من تووشی دەرد**
**دوو ڕەفیقی غوربەتن ڕۆژی سیاهی ڕەنگ زەرد**
**شیعری مەولانا ئەخوێنم هەڵئەکێشم ئاهی سەرد**
**پێم بلێ (خالد) ئەگەر تۆ شێت نەبی و سەحرا نەوەرد**
**تۆ له کوێ ی و (غەزنەین و کابول) خاکی هیند و قەندەهار**

هاوڕێی و هاودەمی غوربەتی سالم ڕۆژی ڕەش و ڕەنگ زەردی و خەمباری و نەخۆشییە، شایەنی باسە ئەم ئاوارەبوون و دەربەدەرییەی سالم، جگە لەوەی بەئاشکرا له شیعرەکانیدا ڕەنگدانەوەکەی دیارە، جێی دەستیشی لەسەر جەستە و دەروونی شاعیریش بەجێ دێڵێت، سالم تووشی ڕەشبینی و نەخۆشی سایکۆلۆژی بووە، هاوسەنگی دەروونی تێکدەچێت، لەدوای میرنشینی بابانەوە ئارامی و خۆشی و هێمنی له ژیانیدا نەدیوە.

**ڕووبەڕووی مەشریق دەچم بۆ موڵکی (ڕەی)**
**ئەلوەداع ئەی قیبلەیی جان ئەلوەداع**

سالم سەفەر دەکات و بەڕەوو (ڕەی) دەچێت، زۆر خەمبار و ناڕازییە، کە شوێن و قیبلەی گیانی بەجێ دێڵێ، واتە (شاری سلێمانی)و خواحافیزی لێ دەکات، ئەم بەجێهشتنەی شوێن و زێدی مرۆڤ زۆر سەختە، ئەمە بەرەو غوربەتی ڕاستەقینەی دەبات، بەرەو نامۆی غەریبی له هەموو ڕوویەکەوە.

**خۆزگە دەمزانی له تارانا نەجاتم کەی دەبێ**
**کۆیی یارە مشهدم یا مدفنم هەر ڕەی دەبێ**

سالم هەر زوو هەست بە بێزاری دەکات له تاران، له غوربەت، دیل و بەند کراوە، بۆیە زۆر خەمێتی و زۆر تامەزرۆیە کە زوو بگەڕێتەوە بۆ شار و وڵاتی خۆی و دەترسێت و دەپرسێت ئاخۆ ژیان بواری دەدات کە بگەڕێتەوە، یان لەوێ دەنێژرێت.

**ابتدا بۆ (ڕەی) کە هاتم فیکری عەقڵیم لێ نەکرد**
**حەپسی تارانم گوناهی کاری بێ تەدبیرمە**

لێرەدا سالم زۆر پەشیمانە له ڕۆشتنی بۆ شاری (ڕەی)، (تاران )وەکو حەپس و بەندیخانەیە بۆی، پەشیمانە



لەوەی هاتووە، پێی وایە کارێکی بێ بەرنامە بووە و گوناه و خەتای خۆیەتی، تا ئەو ڕادەیەی کە لە دێڕێکی دیکەدا دەڵێت: بەهەشت چەند خۆشە و ئامانج و هیوای هەموو کەسێکە پێی بگات، ئەوەندە نزیک بێتەوە بێتە (ڕەی)، سالم بۆی ناچێت ئەوەندە لە غوربەت و ئاوارەبوون و ئێران و تاران بێزارە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێک خزم و کەس و کاری سالم یش لە ئێران هەبوون و ماوەیەک لەلایەن بووە، بەتەواوی بێکەس نەبووە، کەچی هەر بێزار بووە. کە دەڵێت:

**لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بوو لە تارانا**

**بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی بە تارانا گوزەر ناکەم**

جێی وتنە کە سالم تەنیا ئاوارە و دەربەدەری وڵاتی ئێران نەبووە، بەڵکو لە سەردەمی تورکەکاندا ئاوارەکراوە و دوورخراوەتەوە وەکو مووچەخۆرێک بۆ شاری حیللە، دەستبەسەر دەبێت و لە دیمەن و سروشتی جوان و ڕازاوەی کوردستان بێ بەش و دوور دەبێت، لەوانەیە ئاوارەی چەند جێگە و شوێنێکی دیکەش بووبێت، کە بەهۆی نەبوونی زانیاری تەواو و ورد لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی پێمان نەزانیوە، سالم دەڵێت:

**حەسرەتا دڵ غافڵە نازانێ قیسمەت چی دەکا**

**ئەمڕۆ ئێرەم بوو بە مەسکەن ئاخۆ فەردا کوێم دەبا ؟**

هەر لەم شیعرەدا لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت:

**گەردووشی دەوران جڵەوکێش بردمیە ماڵی عارەبێ**

**چووم و دیم ئەمما نەچوومایە درێغا حەسرەتا !**

کە باس لەو خانەخوێیە و میواندارییە، خراپەی ئەو ماڵە دەکات، لەوە دەچێت کە نەفی کراوە و دوورخراوەتەوە بۆ ئەو شارە، هەر لەژێر چاودێری دەسەڵاتداراندا بووە، بۆیە هەر بە فەرمانی ئەوان براوەتە ئەو ماڵە، بێگومان لەوێش غەریب بووە، وا دیارە باشیش مامەڵەیان لەگەڵدا نەکردووە.

**گوێم گرتووە هەمیشە لە ناڵەی حەزینی دڵ**

**(سالم) لە غوربەتا چ بەتأثیرە دەنگی نەی**

گوزارشتکردن لە غوربەت ـ بەڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، ڕەنگدانەوەی لە بەرهەمەکانی شاعیردا دیارە، سالم لە غوربەتا هەمیشە دڵی خەمبار و حەزینی دەناڵێنێ، دڵی بۆتە نەی لەوەی وەکو نەی کون کون بووە، هەروەها وەکو نەی هەمیشە ناڵە ناڵەی دێ و دەنگی لێ بەرز دەبێتەوە، ئەو دەنگ و ناڵەیەش زۆر کاریگەری هەبووە لەسەر دەروونی سالم. وا دەردەکەوێت کە (سالم) جگە لەوەی خزم و کەسی لە ئێران بووە، بە مەبەستی سەردانیان هەندێجار چووە بۆ ئێران، بۆ خوێندن سەردانی ئەوێی کردووە، تا ئەو کاتەی ئاوارەی ئەوێ دەبێت، هەندێ بیروڕاش هەیە کە دەڵێن: لەوە دەچێت ئەو ئاوارەبوونەی تاران و ڕەی، بەخواستی خۆی نەبووە، بە زۆر بووە، لەوێ لە بەندیخانەدا بووە، هەرچەندە وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، سالم دەڵێت ئەم تەدبیرەم هەڵە بوو، کەواتە بەخواستی خۆی بووە، لە ڕاستیدا تا ئێستا بەڵگەی تەواو و یەکلاکەرەوەمان سەبارەت بەم ڕووداوانە لەبەر دەستا نییە، لەوانەشە لێرەوە لەتاو زوڵمی تورکە داگیرکەرەکان بە خواستی خۆی ڕۆشتبێت و پاش ماوەیەک لەوێ بەهۆی ڕووداوێک یان کارێکەوە کە جارێ بۆ ئێمە شاراوەیە و ونە، خرابێتە بەندیخانەوە، بەڵام سالم لەم چەند دێڕەدا وەڵامی نامەکەی (مستەفابەگی کوردی) دەداتەوە و لە حاڵ و وەزعی خۆی دەدوێ کە لە غەریبییە:

**لە زیندانا کە بێ هەمدەردم ئەمڕۆ**

**ئەسیری ناکەس و دڵ بەردم ئەمڕۆ**

**لە دارولحوزنی دووریدا صەبا بوو**

**گەیاندی نامەیی هەمفەردم ئەمڕۆ**

**لە پام گەر بەندە(دەر) وازە لە مەیلم**

**دڵم لاتە ، زەبوون و زەردم ئەمڕۆ**

بەم چەند دێڕەدا وادیارە سالم لە ئاوارەیی و غەریبایەتیدا دیل بووە و گیراوە، لە زیندانا کە هاوخەمی و هاوڕێی لەگەڵ نییە و بێکەسە، نامەکەی (کوردی) پێدەگات و پێی دەڵێت: هەرچەندە دەرگا لە پێ و قاچەکانم داخراوە، چونکە بەندم و نابێت دەرچم، بەڵام دەرگا لەسەر مەیل و بیر و هەستم دانەخراوە، بۆیە هەر بیرتان دەکەم و مەیلی ئێوەمە،

سالم جگە لەو نامە شیعرییەی نێوان خۆی و نالی هاوڕێی، زۆر ئاڵوگۆڕی نامەی شیعریشی لەگەڵ (مستەفابەگی) ئامۆزایدا کە ناسراوە بە (کوردی) هەبووە، وا دەردەکەوێت (مستەفابەگ) لە شاری سلێمانی دەبێت، ئەو کاتە (سالم) لە غوربەت و ئاوارەیی بووە، لە وەڵامی نامەیەکی تری (مستەفابەگی کوردی ) دا، سالم دەڵێت:

**ڕەفیقی گۆشەیی غوربەت، هەراسانن لە ناڵینم**

**لە ئەشکی دیدە ئەمشەو باز لە خوێنا مەوجە باڵینم**

ئەوەتا لە غوربەت، هەموو ئەوانەی لەگەڵمن لەتاو ناڵینم هەراسان و بێزاربوون، فرمێسکی چاوم دووبارە بووە بە خوێن، ئەوەندە زۆر گریاوە.

**ئەگەر دوورم بەلەش، ئەمما بە دڵ بیللا لەگەڵ تۆدام**

**لە ئەحواڵی وڵات ئاگام و بووەتە مایەیی شینم**

ئەمەش یەکێکە لە دێڕەکانی کە وەڵامی نامەکەی کوردی ئامۆزای دەداتەوە، کە هەرچەندە بە جەستە و لاشە لێتان دوورم و لە شوێن و شاری خۆم نیم، بەڵام هەر ئاگام لە دەنگ و باس و هەواڵی وڵات و شارە،



کە دەشزانێت بارودۆخ باش نییە، هەمیشە شین و شەپۆریەتی بۆ شار و وڵاتەکەی.

## چوارەم: غوربەتی کۆمەڵایەتی (أجتماعی)

جیاوازی کلتوور و داب و نەریت، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێت، مامەڵەکردن و تێکەڵاوی لە وڵاتی غەریبی و لەگەڵ کەسانی نەناسراو، کە تۆ وەک غەریب و ئاوارە سەیربکەن و خۆیان خاوەن ماڵن، زۆر سەخت و ناهەموارە، چ جای بێتە سەر باسی خۆشەویستی و عەشق، کە وەک دەڵێت: لێرە هەموو ئارەزووی پلەوپایە و پارە دەکەن، کەسێکی وەکو سالم- یش کە بە گەدا و بێکەس و بێ سەروپێ دادەنێن، کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، خۆشی لەخۆی بێزارە، دەتوانین بڵێین ئەمەش غوربەتی کۆمەڵایەتی بۆ دروست کردبوو.

**معشوقەی ئەم شارە هەموو طالبی جاهن**
**تف لەو کەسە وەك من کە گەدا و بێ سەر و پا بێ**

جیاوازی زمان و کلتوور و کۆمەڵ، دیسان لەم دێڕەدا سالم هەستی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری خۆی نیشان دەدات، ڕاشکاوانە شانازی بەوەوە دەکاتکە کوردە و لە زمانی ئەوان شارەزا نییە.

**مەهی فارس زەبانەم گوفت (سالم)شرحی حالەت گۆ**
**وتم: جانا بەڵەد نیم أصطلاحی ئێوە من کوردم**

دەشتوانین بڵێین سالم کە لە سلێمانیش بووە، هەر غەریبی و نامۆی کۆمەڵایەتی لا دروست بووە، چونکە لەگەڵ ئەو کۆمەڵ و دەستە خەڵکەدا ناگونجێت، کە هەر بەرژەوەندی خۆیان دەوێت و خۆ فرۆشن، لە کوێوە "با" بێت شەنی خۆیان دەکەن، زۆر لێیان تووڕەیە و قسە و جنێویان پێ دەدات کە دەڵێت:

**لە ئەوضاعی سلێمانی ئەوانەی شاد و ئاسوودەن**
**لە فەرعا نوطفەیی حەیضن لە أصلا جنسی شەیتانن**

لە جێیەکی دیکەدا دەڵێت:

**گەهێ هەمدەردی ئەکرادن، گەهێ هەم عەیشی ئەتراکن**
**لە یەك لا مادەری بەرخن لە یەك لا یاری گورگانن**

**ئەنجام:**

١- شیعرەکانی (سالم) ئاوێنەیەکی غوربەتە، وێنەی خەم وخەفەت و پەژارەی دەروونیانەی میللەتی کوردیی ئەو سەردەم و قۆناغە پیشان دەدات، زۆر زیاتر لە هاوڕێی و هاوزەمەنەکانی ئەم هەستە زاڵە بەسەر شیعرەکانیدا.

٢- (سالم) خۆی ون کردووە. لەناو شار و وڵاتی خۆیدا هەست بەنامۆبوون و غەریبی دەکات، لە غوربەتی دەروونیدا هەست بەمە دەکەین، کە باسی زەلیلی و کەم نرخی و بێزاری خۆی دەکات.

٣- ئەوەی ئازاری (سالم) دەدات تەنیا ئەو شار و وڵات و کۆمەڵگەیە نییە کە لەگەڵ داب و نەریت و پەیوەندی و بارودۆخی ئەودا ناگونجێن و هەست بەغەریبی تیادەکات، بەڵکو پەیوەندی و پچڕانێتی بەو کۆمەڵگەیەی لێی دوورکەوتۆتەوە، کەواتە بەتەنیا ئەو شوێنەی تیا دەژی نەبۆتە خەم بۆ شاعیر، بەڵکو ئەو شوێنەی لێی دوورە خەمی ئەوە، بۆیە ڕاستە لەگەڵ بارودۆخی غەریبی و شاری ڕەی و تاران دا ناسازێت، بە بەردەوامیش خەم بۆ کۆمەڵ و نەتەوە و زێدی خۆی دەخوات، کەواتە هەر خەمی خۆی نەبووە.

٤- (سالم) هەر تەنها کە ئەو کات و ساتە ئاوارە و نامۆ نەبووە کە شار و وڵاتی جێ هێشتووە و بەجەستە لێی دووربووە، بەڵکو ئەو ساتانەش هەستی بە بێکەسی و تەنیایی و غەریبی کردووە، کە لەناو وڵات و شاریشدا بووە، ئەمەش بەهۆی ناهەمواری و زورووفی سیاسی وڵاتەوە، نەگونجانی لەگەڵ کۆمەڵ و دەسەڵات و قبوڵ نەکردنی داگیرکەر و حوکمڕانە نوێیەکە، بۆیە غوربەتی دەروونی و سیاسی و شوێنی و کۆمەڵایەتی لە شیعرەکاندا دیارە.

٥- شاعیرێکی ئەڵمانی دەڵێت: (ئەگەر ویستت دێڕە شیعرێک بنووسیت، ئەبێت زۆر شوێن گەڕابیت، زۆر شتت دیبێت، گوڵت چنیبێت، بە کورتییەکەی دەقی شیعری ئەزموون و چەرمەسەریە)، کاریگەری ئاوارەیی و غوربەت لەسەر شاعیر و توانا و لێهاتوویی (سالم) دەردەخات لە سوود بینین لەو ئەزموون و ڕووداوانەی بەسەریدا هاتوون و چۆن بەو شێوە کاریگەر توانیویەتی لەناو شیعرەکانیدا تەوزیفی بکات، پێم وایە ئەگەر کاریگەری و بەهێزی ڕووداوەکە نەبووبێت، بەو شێوەیە لە شیعرەکاندا ڕەنگی نەدەدایەوە.


ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم بابەتە سوودم لێ وەرگرتوون:

١- المنجد فی اللغه والادب والعلوم ، لویس معلوف، بیروت، ١٩٦٦

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، د.مارف خەزنەدار، بەرگی سێیەم، دەزگای ئاراس، ٢٠١٠.

٣- بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم، محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای ئاراس ، ٢٠١٠

٤- دیوانی سالم، گیو موکریانی، بێ ساڵ و شوێنی چاپ.

٥- دیوانی مستەفابەگی کوردی، ساغکردنەوەی حەمەبۆر، دەزگای ئاراس، ٢٠١٠

# نوسخەیەکی دەسنووسی دیوانی «سالم»



**سەباح حسەینی**
**ماستەری زمان و ئەدەبی فارسی ـ سەقز**

**کورتە :**
ئاسمانی ئەدەبی کوردی، بە گەلێك ئەستێرەی پڕشنگدار ڕازاوەتـەوە. یەکێ لەو شاعیرانەی کە لە کۆڵەکەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی دێتە ئەژمار، عەبدولڕەحمان بەگی «سـالم»ە. ئەم کەڵە شاعیرە هەر لە سەردەمی خۆیەوە ناوی بە زۆربەی شار و خوێندنگەکانی کوردستان گەیشتووە و شیعرەکانی لای لایەنگرانی شیعر و ئەدەبی کـوردی جێی خـۆی کـردووەتـەوە. یەکێ لـەو شوێنانە کوردستانی ڕۆژهەڵاتە کە شیعری سالم ئاشنای هەر زانا و شاعیری ئەو ناوچەیە بووە. ئەم وتارە ئەیەوێ یەکێ لەو کەسانەی کە کاری لەسەر دیوانی «سالم» کردووە، لەگەڵ نوسخە دەسنوسەکەیدا بیناسێنێ.

**وشە سەرەکییەکان :**
عەبدولڕەحمان بەگی سالم، دەسنووس، دیوانی شیعر، مامۆستا هەیبەت

شیعری شاعیرانی ئـەدەبـی کلاسیکی کــوردی، هێشتا لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەلی لەسەر نەکراوە و ئاسەوار و بەرهەمی شۆڕەسوارانی ئەم مەیدانە بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نەخراوەتە بـەر دەستی خوێنەر. یەکێك لەو شاعیرانە عەبدولڕەحمان بەگ کوڕی محەمەد بەگی قەرە جەهەننەمی کوڕی ئەحمەد بەگ لە بنەماڵەی ساحێبقرانە. ئەم شاعیرە مەزنە هەرچەند لە کۆڵەکەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردییە، بەڵام تاکو ئێستا هەرچەند کار لەسەر شیعرەکانی کراوە، بەڵام هیچکام لەو کارانە نەیانتوانیوە

دەنگ و ڕەنگی سالم بەو چەشنەی کە وابووە بە کۆمەڵگەی نیشان بدەن.
لەو کارانەی کە لەسەر شیعرەکانی سالم کراوە، ئەتوانین ئاماژە بە دیوانی سالم چاپی بەغدا (١٩٣٣) کە کوردی و مەریوانی لە چاپیان داوە، دیوانی سالم چاپی گیو موکریانی، دووکاری مامۆستا محەمەدعەلی قەرەداغی بەناوەکانی «بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم» و «هەنگاوێك لە سەر ڕێگە» لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم و دواین کار کە کاروان عوسمان خەیات کردویەتی بدەین.
بە داخەوە لەم کارانەدا کەم و کوڕی و هەڵەی زەق و چاو لا نەپۆشراوی زۆر هەیە کە تا سنووری تەحریفی شیعری «سالم»یش ڕۆیشتوون. کە هۆکەیشی شارەزا نەبوونی ئەم کەسایەتییانە بەسەر ئەدەبی کلاسیکی فارسیدایە. ئەم هەویرە ئاوی زۆری دەوێ و ئێرە جێگەی ئەم باسە نییە.
یەکێ لە شاعیران و نووسەرانی بەناوبانگی کورد کە بە داخەوە زۆر ناسراو نییە، بەڵام زیاتر لە سەد بەرهەمی بە فارسی و عەرەبی و کوردی لێ بەجێماوە، مامۆستا سەید محەمەد سادق حسەینی ناسراو بە «هەیبەت»ە، کە یەکێ لەو کارانەی کردوویەتی، کۆکردنەوەی دیوانی «سالم»ە.

### مامۆستا سەید محەمەد سادق حسەینی کێیە؟


سەید محەمەد سادق حسێنی

مامۆستا سەید محەمەد سادق حسەینی ناسراو بە «هەیبەت»، کوڕی سەید ڕەزا لە ساڵی ١٢٩٥ کۆچی لە گوندی «قەڵاگا»ی ناوچەی سارالّی شاری دیواندەرە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لە دایکبووە. خوێندنی خۆی لە گوندی «قەڵاگا» دەس پێکردووە. پاشان چووەتە شاری سنە و لە خوێندنگەکانی ئیمام زادە پیر عومەر، مزگەوتی دارولسەلام، و مەدرەسەی شێخ محەمەد سەلیمی سنەیی[1] (سالمی سنەیی) بۆ ماوەی پازدە ساڵ خوێندویەتی. لە دواییدا لە دەوروبەری شارەکانی سنە و دیواندەرە لە گوندەکانی کوچك چەرموو[2] و کەسنەزان[3] لە خزمەت مامۆستا عەبدولعەزیزی ڕووحزادی[4] بۆ ماوەی دوو ساڵ خوێندوویەتی.
ساڵی ١٣٢٣ی کۆچی چووەتە شاری بانە و لە مەدرەسەی «یونس خان» بۆ ماوەی دوو ساڵ لە خزمەت حاجی شێخ یەحیا کاژاوی[5] کە لە زانایانی بەناوبانگی ئەو سەردەمە بووە زانستەکانی فیقه و ئادابی بەحس و جەدەل ئەخوێنێ.
ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی ڕێگەی شاری مەهاباد ئەگرێتە بەر و تاکو ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی لە مزگەوتی سوور، زانستەکانی تەقویم و ئەستێرەناسی و ئوسترولاب و هەیئەت لە خزمەت زانای بەناوبانگ مامۆستا عەبدولڕەحمان کە بۆ خۆی لە قوتابیانی مەلا عەلی قزڵجی بوو ئەخوێنێ.
ساڵی ١٣٢٧ گەڕاوەتەوە بۆ دەوروبەری شاری سنە و پاش ماوەیەك لە ڕێگەی کوردستانی عێراق چووەتە کوردستانی تورکیا و لە شارەکانی نەهری و باش قەڵا بۆ ماوەیەکی کورت خەریکی خوێندنی علوومی غەریبە بووە. لە دواییدا گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی شارەزوور و پاش ماوەیەك خوێندن لە ئاکامدا لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی ئیجازەی ئیفتا و تەدریس لە دەستی زانای بەناوبانگ مامۆستا عەبدولقادری کانی کەوەیی، مامۆستا و مۆدەریسی خوێندنگەی بیارە وەرگرتووە.
لە دوای تەواوکردنی خوێندن و گەڕانەوە بۆ ئێران، زۆربەی ژیانی لە گوندەکانی قەڵاگای سارالّ، دەرەسفتە، کەسنەزان و کەرەفتووی سەر بەشاری دیواندەرە، و ئاڵکەڵو لە نزیکی شاری سەقز بە وانەوتنەوە و لێکۆڵینەوە و نووسین

١ ـ شێخ محەمەد سەلیم کوڕی شێخ ئەحمەد لە ساڵی ١٢ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. ئاسەوارێکی زۆری بە فارسی و کوردی و عەرەبی لێ بەجێماوە کە بەشێکی زۆر لەم ئاسەوارە نوسخەیان لەلای من هەیە. ئەم زانایە مەشهوورە بە «ئیمرەئولقەیسی» کورد.
٢ ـ کوچك چەرموو : سەر بە شاری سنەیە.
٣ ـ کەسنەزان : سەر بە شاری دیواندەرەیە.
٤ ـ مەلا عەبدولعەزیز لە زانایانی بەناوبانگی کوردە. ساڵی لە دایکبوونی نادیارە. بەڵام لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچی فەوتی کردووە. چوار بەرهەمی ئەم مامۆستایە لە لای منە.
٥ ـ حاجی شێخ یەحیا لە زانایانی گەورەی کوردە کە لە ساڵی ١٣٣٣ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. (علماونا فی خدمه العلم و الدین، ل ٦٢٧ و ٦٢٨).

تەرخان کردووە. لە ئاکامدا لە بەرواری ڕۆژی هەینی ٢ی مانگی سەفەری ساڵی ١٣٥٥ی کۆچی کاتژمێر ٢/٢٥ خولەکی دوای نیوەڕۆ کە مامۆستا و مودەڕسی گوندی «ئاڵکەڵوو»ی سەر بە شاری سەقز بووە، لە خانەقای شێخ جەلالەدینی نەقشبەندی ناسراو بە «دەهشەت» کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی گوندی ساحێب لە نزیکی شاری سەقز ئەسپەردەی خاك دەکرێ.

مامۆستا هەیبەت لە زانایانی بەناوبانگی کوردی کە زیاتر لە ٨٠ بەرهەمی بە فارسی و عەرەبی و کوردی لێ بەجێماوە(٦٠) کە کۆکردنەوە و شاعیرانی کورد وەکو: مەلا خزری رواری، مەولەوی تاوەگۆزی، نالی، سالمی سلێمانی، سالمی سنەیی، مستەفا بەگی کوردی، شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی (خالیس)، شێخ عومەری بیارە، شێخ نەجمەدین کوڕی شێخ عومەری بیارە، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، و ... لە کارە بە بایەخەکانی ئەوە.

یەکێ لەو کارە بە بایەخانەی کە مامۆستا هەیبەت کردوویەتی کۆکردنەوەی دیوانی عەبدولڕەحمان بەگی سالمە، کە ئەم وتارە تایبەت بە ناساندنی ئەم نوسخەیە. ئەم نوسخەیە بە خەتی زۆر جوان نووسراوەتەوە. زۆر بەباشی ماوە، تەڕ و نمی لێ نەکەوتووە. ئەو نوسخەیە کە لەناو کەشکۆڵە نایابەکەی مامۆستا هەیبەت– دایە کە سەرجەم ئەم کەشکۆڵە جگە لە دیوانی سالم و شیعری شاعیرانی عەرەب و فارس، شیعری ئەم شاعیرە کوردانەشی تێدایە : «مستەفا بەگی کوردی، نالی، جەمیل بەگ، شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانی، مەستوورە ئەردەڵان، خاتوون بەهجەتی سنەیی، شێخ نەجمەدین بیارە، مەولانا خالید نەقشبەندی، شێخ ڕەزا تاڵەبانی، مەلا مەعرووف کۆکەیی، شێخ حەسەن سوورێنی، قازی محەمەد کەریمی سەقزی، مەلا ئەحمەدی فەوزی، شێخ مەحموودی خورمتایی، شێخ جەلالەدین نەقشبەندی (دەهشەت)، حەریق، سەیدی، تاهیر بەگ، میسباحولدیوانی ئەدەب، ناری، ئەمین، فیکری، بیمار، غەریب، ئازاد، وەفایی، شێخ بەهائەدین کوڕی شێخ سیراجەدین، مەلا عەبدوڵڵا بێتووشی، شێخ وەسیمی سنەیی، خاکی، مەحوی، مەفتوون، مەسیحی، ڕەنجووری، سەید محەمەد سادقی سەفاخانە، شێخ جەلال ناسراو بە «ئەمینولئیسلام»، مەلا محەمەد ئەمینی پێنجوێنی، میرزا حەسەنعەلی ئەدیب دەفتەر، حاجی قادری کۆیی، ئەمین یومنی، شێخ عومەر بیارە، و شیعری مامۆستا هەیبەت خۆی.

بەڵام ئەم نوسخەی دیوانی سالم، ٣٠ لاپەڕەیە. بەخەتی مامۆستا سەید محەمەد سادقی حسەینی «هەیبەت»

٦ـ ل

ساڵی ١٣٣١ی کۆچی نووسراوەتەوە. لە سەرەتاکەی دا نووسراوە: «دیوانی عەبدورڕەحمان بەیگ متخلص بە سالم سلیمانی رە.». واتە دیوانی عەبدولڕەحمان بەگ ناسراو بە سالمی سلێمانی ڕەحمەتی خوای لێ بێ. و لە پەراوێزی لاپەڕەی یەکەمی ئەم دیوانە نووسراوە: «جمع دادن این دیوان به ترتیب حروف هجا از این حقیر سیدمحمد صادق هیبت تخلص است» واتە: کۆکردنەوەی ئەم دیوانە و چنینی بە پێی ئەلف و بێ لە منی بچووک سەید محەمەد سادق ناسراو بە «هەیبەت» هـ .

لە کۆتاییەکەیدا نووسراوە: تمّ دیوان السالم بعون رازق الجاهل و العالم فی سنه ١٣٣١.

ئەم نوسخەیە ٥٩ پارچە شیعری سالمی تێدایە کە لەم ٥٩ پارچەیە، ٨ی فارسییە و ئەوانەی دیکە هەموو بە کوردین.

ئەم نوسخەیە لەباری شێوەی نووسینی شیعرەکانی سالمدا لەگەڵ نوسخە چاپکراوەکاندا جیاوازی هەیە. و ئەو هەڵانەی کە لە نوسخە چاپکراوەکاندا هەیە بە دەگمەن لێرەدا دەی بینین. لێرەدا نیو بەیتی سەرەتای تەواوی ئەو شیعرانەی کە لەم نوسخەدا هاتوون بۆ ئاگاداری ئەیهێنم. سەرەتای ئەو شیعرانەی وا لەم نوسخەدا هاتووە:

**١. بە دەل کەین با لە نەشئەی مەی خوماری میحنەتی دونیا**
**٢. ئەگەر ئومیدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهان ئارا**
**٣. کشا گیسوو بە گۆشەی روویی یارا**
**٤. دەستی من تەعویزە بۆ ڕەددی بەڵا**
**٥. شەهیدی دیدەیی مەخمووری شۆخێکم منی شەیدا**
**٦. لە عەرسەی ئەوجی عەشقت تازە دڵ هەڵسا لە تەیرانا**
**٧. ساقی لە پەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا**
**٨. سونبولی توررە کە پەرژینە بە پەهلوویی گوڵا**
**٩. زوڵفی جانانە بە دەوری کەمەرا**
**١٠. صبح نوروز وقت بزم شراب (فارسی)**
**١١. ئابی حەیاتی منە بووسەی لێوی حەبیب**
**١٢. لە زوڵف ئەگریجەکەت بۆ کوڵم و غەبغەب**
**١٣. تا مشک سیه بر سر گل چتر برانداخت (فارسی)**
**١٤. جەهان ئارایە مەهـ ئەممانە وەک رووت**
**١٥. دڵە خەڵوەت سەرای مەحببەتی دووست**
**١٦. هەر دیتنی تۆیە دڵ بکا شاد**
**١٧. مەشقی مەردی بە کەرەم کەسبی جەلالەت بە سوجود**
**١٨. دەدا هەردەم شەکەر خەندەت سەمەرقەند**



١٩. چنین صورت تو داری چین ندارد (فارسی)
٢٠. بنووسم چون لە هیجرانا بە یاری سیمبەر کاغەز
٢١. بە تەقدیمی وەفا ناردی نیگاری سیمبەر کاغەز
٢٢. ایام گل و عهد گل و موسم بهار (فارسی)
٢٣. غبغب و خال رُخ و گرّه یار (فارسی)
٢٤. رەها ناکا دڵم توررەی خەمی یار
٢٥. لەناو زوڵفا برۆی دڵدارە مەستوور
٢٦. وەکو نەی تا لەبم نەگریٚ لەبی یار
٢٧. بە دڵ وەقتی نیگەهـ موژگانی دڵبەر
٢٨. رافیزی و شێعەن لە هەر دوو لا نەزان و بێ خەبەر
٢٩. نیگەهـ کەی گەر بە جادوو فیتنە ئەنگێز
٣٠. ئەلوەداع ئەی موڵکی بابان ئەلوەداع
٣١. گوارەت کەوتە سەر رووش و بناگووش
٣٢. لە چەرخی حوسنتا هاتن موتابق
٣٣. لیلی وشان ملک عرب جمله یک به یک (فارسی)
٣٤. سهی قدان مشکین زلف و پرچم (فارسی)
٣٥. دەمەویٚ مەستی بادە بم دایم
٣٦. قەت تەواو نابێ ئارەزووی یارم
٣٧. بیا دل از پریشانی به زلف دلبر اندازیم (فارسی)
٣٨. خیز تا در قدمت مشک معگر بینم (فارسی)
٣٩. دل روا نیست ز مهرت به ستم بردارم (فارسی)
٤٠. حیسابی نەفخەیی زوڵفت لەگەڵ موشکی خەتا
٤١. روە یا گوڵ ئەمە یا بەرگی نەسرین
٤٢. مەعنیانن وەکوو یەک شەرحی من و دولبەری من
٤٣. سەر و کاری خەیاڵت ئیبتیدا وەختێ لەگەڵ دڵ بوو
٤٤. لەنووری لامیعی تەشتێکی راگرت و وتیی روومە
٤٥. لە تەرەف یارەوە نۆبەی نەزەرە
٤٦. تەفەروج گاهی دڵ گوڵزاری رووتە
٤٧. رووی لەناو توررە چرایە لە شەوایە
٤٨. أَلا یا أیها الساقی بە موفلیس وەقتی ئیحسانە
٤٩. ئۆف خودا ئەم جەژنە بۆ حاڵی غەریبان ماتەمە
٥٠. خزروارم ئەگەر ماچێ کەرەم کەی
٥١. غەرقە لە دڵم پەیکان پەیوەستە بە موژگانی
٥٢. بە پابۆسی بە قەد تاگوررە تا کەی چین بە چین دەرژێ
٥٣. ئەمرۆ بە دولبەری شوهرە و رەمزی کیشوەری
٥٤. بۆ پاسی روو لە توررەی مووماری ئەرقەمی
٥٥. بە خودائی کە رۆژ و شەو دێنێ
٥٦. لەتیف و سەر و قەدد و گوڵ جەمینی
٥٧. راستە ئەی زوڵفی سیەهـ مارانی
٥٨. بر سر مصحف رو زلف چلیپا داری (فارسی)
٥٩. رۆژی دڵ هەر شەوی تارە چ لەمێ بێ چ لەوێ.

لە پەراوێزی چەند لاپەرەی ئەم نوسخەیە، چەند شیعر لە شێخ رەزا تاڵەبانی و مەحوی هاتووە.



یەکێك لەدەستنووسەکان


**سەرچاوەکان :**

١- دیوانی سالم، ئامادەکردنی: گیو موکریانی، چاپەمەنی محەمەدی سەقز
٢- دیوانی سالم - دەسنووس.
٣- علماؤنا فی خدمه العلم و الدین. تألیف الشیخ عبدالکریم المدرس، الطبعة الأولی، بغداد ١٤٠٤.
٤- دیوانی اشعار، ماموستا سیدمحمد صادق حسینی، به کوشش صباح حسینی، چاپ اول، انتشارات پرتو بیان سنندج ١٣٨٦.
٥- تاریخ مشاهیر کُرد، تألیف : بابا مردوخ روحانی، ٣ج، انتشارات سروش، چاپ دوم، تهران ١٣٦٤.
٦- بەرکوتێك لە خەرمانی شیعری سالم، محەمەد عەلی قەرەداغی، ئاراس هەولێر، ٢٠١٠
٧- هەنگاوێك لەسەر لێکۆڵینەوەی دیوانی سالم، محەمەد عەلی قەرەداغی، ئاکادیمیای کوردی، هەولێر ٢٠١٠
٨- عەقیدەی کوردی دانراوی مامۆستا سەید محەمەد سادق حسەینی، ئامادەکردنی سەباح حسەینی، چاپی یەکەم، ١٣٩٠ی هەتاوی.

# ڕوونكردنەوە و ڕاستكردنەوەی پەراوێزێك لە پەراوێزی دوو قەسیدەی (سالم) دا

كاروان عوسمان خەیات

لەوەتەی گوێ لە مەقام و گۆرانی سوونەتی کۆنی کوردی دەگرم و شیعری شاعیرانی کلاسیکی کۆنی کوردی دەخوێنمەوە، وەکو خولیایەک بۆ هەر یەکێک لەو بابەتانە، ئارەزووەمە بزانم ئەو هۆنراوە لە ساڵی چەندا نووسراوە و بۆچی نووسراوە و بۆ کێ وتراوە، ئەگەریش کرابێتە گۆرانی، حەزدەکەم ئاوازەکەی ئاوازی ڕەسەنی کوردی بێت، هەر بۆیە وەکو خولیایەک بۆ زانین و ڕێکخستنی ساڵی هەر بەرهەم و ڕووداوێک لە شیعری شاعیرانی کۆنی کوردی دا، حەز دەکەم ساڵی نووسینی بەرهەمەکە بزانم، بشزانم بابەت و ڕووداوەکەشی چۆن بووە و چی ڕوویداوە؟!

کاتێک بۆ سیمیناری سالم پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردم کە ئەو دەستنووسانەی لەلای من هەیە ئەگەرچی بڵاویش کراوەتەوە، دووبارە ڕێنووس بکرێنەوە و بخرێنە بەردەستی خوێنەران و لێکۆڵەرانی شیعری کلاسیکی کوردی و ئاوڕی لێ بدەنەوە و ساغی بکەنەوە، کاری ئەو بەشەی دیوانی سالم زۆر بە پەلە و هەڵەداوان بوو، شیعرەکانیش زۆربوون و کاتیش کەم بوو، هەم من ڕێگای سەفەرم لەبەردا بوو، هەمیش کاری سیمینارەکە لەبەر ئەو دەستنووسانە دواخرا بوو کە من کاریان لە سەر بکەم، بەهەرحاڵ وەکو ئەوەی پێم گەشتووە و پێم وتراوە، دەڵێن: هەڵەی تێدایە، بەڵام تاکو ئێستا یەک بابەت لە سەر ئەو کتێبە نەخراوەتە ڕوو، هەموو ئەوانە تەنها بەس قسە بوون و بە تەلەفوون و دانیشتنی دۆستانەی برادەران بوون لەملا و لەولا...

بەش بەحاڵی خۆم زۆرم پێ خۆشبوو کەسێک چاوی بەو دیوانەدا بخشاندایە و هەڵەکانی چاک بکردایەتەوە و لە بابەتێکدا بیخستایەتە ڕوو، چەند نووسخەیەکیشم بە دکتۆر و نووسەرانی کەیش داوە بۆ ئەوەی چاوی پێدا بگێڕن و هەڵەکانم پێ بڵێن، بەڵام تاکو ئێستا یەک کەس ئەو هەڵانەی ڕاست نەکردۆتەوە و هیچیشم پێ نەگەیشتۆتەوە.

هەر لە پەراوێزی ئەو کارەدا بۆ دیوانی سالم، نووسخەکەی خۆشم بە کاکە حەمەی مەلا کەریم و بنکەی ژین دابوو، ئەمە پێش ئەوەی من کاری دیوانەکە ئەنجام بدەم و بخرێتە بەر دیدەی

خوێنەران، هەر لەو پەراوێزەدا چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەکم لە بەردەستدا بوون کە هۆنراوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر سالم تێدا بوو، بەڵام ئەوەی من ئەنجامم دابوو، تەنها کۆکردنەوەی ئەو شیعرانە بوون لە دەستنووسەکەدا و یەک دوو گۆڤاری کەش کە شیعری سالمی تێدابوو، پەیوەندیشیان هەبوو لەگەڵ کارەکەی مندا، بۆیە سوودم لەو سەرچاوانەش وەرگرت.

یەکێک لەو گۆڤارانەی کە لە بەردەستمدا بوو، گۆڤاری (ئەکادیمی) ژمارە (١٧)ی ساڵی (٢٠١١) ی ئەکادیمیای کوردی بوو، لەم گۆڤارەدا دکتۆر عوسمان دەشتی بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە بەناوی (لە پەراوێزی دوو قەسیدەی (سالم) دا "تێکست و لێکۆڵینەوە").

لەم بابەتەدا دکتۆر عوسمان لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژی لەسەر دوو قەسیدەکەی سالم نووسیوە، ئەگەرچی زۆر ڕەخنەی لە مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی گرتووە، بەڵام کاری باشی کردووە، مەبەستیشم لە هەردوو لاکەیە، چونکە هەردوولا لە پێناوی ئەدەبی کوردیدا کار دەکەن و خزمەتی گەورەیان بە ئەنجام گەیاندووە، ئەگەریش هەڵە و کەم و کورتی هەبێت، ئەوا مرۆڤ دەبێ بەهێمنی و بە بەڵگەوە کاری ڕاستکردنەوەی بۆ ئەنجام بدات و دەستی ماندوو بوونی بگوشێت، من لێرەدا دەستخۆشی لە هەردوو مامۆستای ناوبراو دەکەم و هیوای لەشساغییان بۆ دەخوازم، لێرەشدا من نامەوێ لایەنگری هیچ کەسێک بکەم و هیچ کەسێکیش تاوانبار بکەم، بەڵام دەمەوێ هەڵەیەک هەیە و ڕاست بکرێتەوە، هەڵەکەش مێژووی ساڵێکە و دەبێ چاوی لێ دانەخەین، چونکە ئەم ساڵە و ئەم قەسیدەیەی سالم قسە و باسی زۆری لەسەرە.

هەر لەم ماوەیەدا مامۆستا جەعفەری خۆشەویست زۆر بە لێبووردوانەوە بابەتێکی پێشکەش کردم بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە و ڕا و سەرنجی تایبەتی خۆمی لە بارەوە بڵێم، کاتێک کە تەواوی بابەتەکەم دوو جار خوێندەوە، دیتم مامۆستا هیچی بۆمن نەهێشتۆتەوە کە قسەی لەسەر بکەم، بەڵام لە کۆتاییدا بەیتێکی لە قەسیدەکەی سالم خستبووە ڕوو، ئەو بەیتەش بریتی بوو لە بەیتی:

**ئەهلی دانش حاتەمی بەخشش بە ئەبجەدکەن حساب**

**با نەڵێن: کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە**

مامۆستا جەعفەر لە بارەی ئەم بەیتەوە دەڵێت: (زۆربەی نووسەرانی کورد، ئەم دوا بەیتی ئەو قەصیدەیەی بۆ عەبدوڵڵا پاشا نووسراوە، تێنەگەیشتوون. هەر چەند ئەو بە ڕوونی تاریخەکەی بە حیسابی ئەبجەد درکاندووە).

لێرەدا دەڕۆمە سەر ئەسڵی بابەتەکە و دەڵێم: قسە و باسی منیش لە سەر ئەم ساڵەیە کە دکتۆر عوسمان دەشتی لە بابەتەکەیدا تەواوی قەسیدەکەی سالمی هێناوە و لە کۆتاییشدا پەراوێزێکی بۆ نووسیوە و دەڵێت:

**ئەهلی دانش، حاتەمی بەخشش، بەئەبجەدکەن حیساب**

**بانەڵێن کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە**

دکتۆر بۆ ئەم بەیتە پەراوێزی ژمارە (٤٢)ی داناوە و دەڵێت:

**ئەهلی دانش: زانایان، حاتەمی بەخشش: حاتەمی بەخشین.**

– ئەگەر بە حیسابی ئەبجەد ئەو ڕستەیە، لێک بدرێتەوە (کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە) ئەوا بەرامبەر (١٢٨١)ی کۆچی دەوەستێ، کە ئەمەش ڕێکەوتی (١٨٥٤)ی زایینییە.

قسە و باسی من لەسەر ئەم پەراوێزە و ئەو بەیتەی سەرەوەیە کە دکتۆر لە بابەتەکەیدا ئاماژەی پێ کردووە و لە سەرەتای بابەتەکەشدا دەڵێت: (د. کەمال فوئاد دەڵێ: لە دوای بەرەڵابوونی عەبدوڵڵا پاشای بابان و گەیشتنی بەغدا، سالم ئەم قەسیدەیەی گوتووە، ئەم قەسیدەیە لە (٤٢) دێڕ پێک دێت و ساڵی (١٢٧٠-١٨٥٤ز) گوتراوە.

سەرەتا دەمەوێ ئەو پرسیارە ڕووبەڕووی دکتۆر خۆی بکەمەوە، ئایا لە پەراوێزی (*)ی سەرەتای قەسیدەکەدا دەڵێت: د. کەمال فوئاد دەڵێت ساڵی (١٢٧٠-١٨٥٤ز) نووسراوە و دکتۆر عوسمان خۆشی دەڵێت: ساڵی (١٢٨١-١٨٥٤ز) نووسراوە و دەکات، باشە خوێنەر باوەڕ بە کامیان بکات؟!

دەبێ بپرسین: ئاخۆ دکتۆر عوسمان دەشتی بۆچی ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە کە کەمال فوئاد هەڵەی کردووە و ئەم ڕاستی کردۆتەوە و بەم پێیە قسەکەی کەمال فوئاد هەڵەیە؟! چی لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجام داوە، کامەیە و چۆنە؟ بۆ نەخراوەتە ڕوو؟.

من تەنها هەڵەی نێوان کەمال فوئاد و عوسمان دەشتی بە ساڵی کۆچی (١١) ساڵ ببینم و ساڵی زایینییەکەش لەلای هەردووکیان هەر ساڵی (١٨٥٤) بێت، تۆ بڵێی ساڵی زایینی (١١) ساڵ وەستابێت و حەرەکەیەکی نەکردبێت؟!

ئەمە لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە دکتۆر عوسمان دەشتی لە پەراوێزی ژمارە (٤٢) دا نیوە بەیتەکەی دیاری کردووە و دەڵێت: (کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە)، ئەمە لێک بدرێتەوە ساڵی (١٢٨١)

ی کۆچی دەکات بەرامبەر بە ساڵی (١٨٥٤)ی زایینی.

ئێمە لێرەدا هەر ئەو بەیتەی سالم لێک دەدەینەوە کە دکتۆر خۆی لە پەراوێزی ژمارە (٤٢) دا ئاماژەی پێکردووە و خستوویەتییە نێو کەوانەوە.

ک ٢٠+ ا ١+ ن ٥٠+ ی ١٠ = ٨١
ک ٢٠+ ه ٥+ ر ٢٠٠+ ه ٥+ م ٤٠ = ٢٧٠
ک ٢٠+ ه ٥+ ی ١٠ = ٣٥
ب ٢+ و ٦+ و ٦ = ١٤
ب ٢+ ه ٥ = ٧
ب ٢+ ا ١+ ب ٢+ ا ١+ ن ٥٠ = ٥٦
ه ٥+ ا ١+ ت ٤٠٠+ ه ٥+ و ٦+ ه ٥ = ٤٢٢
٨١+ ٢٧٠+ ٣٥+ ١٤+ ٧+ ٥٦+ ٤٢٢= ٨٨٥

لێرەدا دەپرسین ئاخۆ دکتۆر ئەم لێکدانەوەیە بە هەڵە دەزانێت یان بە ڕاست؟! لێرەدا ئەوەش دەڵێم لەوانەیە دکتۆر ئەو هەڵەیە بداتە پاڵ تایپیست و بڵێت تایپیست وشەی (با نەڵێن)ی نەنووسیوە بۆیە ئەو هەڵە ڕووی داوە، ئێمەش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو هەڵەیە کە دەخرێتە ملی تایپیست، ئەو دوو وشەیەش لێک دەدەینەوە و کۆی دەکەینەوە لەگەڵ ئەو نیوە بەیتەی کە دکتۆر ئاماژەی پێکردووە لە نێوان دوو کەوانەکەدا:

ب ٢+ ا ١ = ٣
ن ٥٠+ ه ٥+ ل ٣٠+ ی ١٠+ ن ٥٠ = ١٤٥
٨٨٥+ ١٤٥+ ٣= ١٠٣٣ی کۆچی بەرامبەر بە زایینیش دەکاتە (١٦٢٤).

ئەڵبەتە مامۆستا جەعفەریش ئەو ساڵەی وەرگرتووە، بەڵام من لێرەدا تەنها قسە لە سەر ئەم پەراوێزەی دکتۆر عوسمان دەشتی دەکەم، چونکە تەواوی ئەو لێکدانەوەم پێشکەش بە مامۆستا جەعفەر کردووە وەکو تێبینییەک بۆ بابەتەکەی بەڕێزیان.

من لەم باسەدا درێژە بە قسەکانم دەدەم و دەڵێم با نیوە بەیتی یەکەمیش لێک بدەینەوە و بزانین چی لەو نیوە بەیتەشدا دەردەکەوێت. دکتۆر نیوە بەیتەکەی بە ڕێنووسی نوێی کوردی نووسیوە، ئێمەش هەر ئەو ڕێنووسە نوێیەی دکتۆر نووسیویەتی، لێکی دەدەینەوە:

ئەهلی دانش، حاتەمی بەخشش، بەئەبجەدکەن حیساب

ا ١+ ه ٥+ ه ٥+ ل ٣٠+ ی ١٠ = ٥١
د ٤+ ا ١+ ن ٥٠+ ش ٣٠٠ = ٣٥٥
ح ٨+ ا ١+ ت ٤٠٠+ ه ٥+ م ٤٠+ ی ١٠ = ٤٦٤
ب ٢+ ه ٥+ خ ٦٠٠+ ش ٣٠٠+ ش ٣٠٠ = ١٢٠٧
ب ٢+ ه ٥ = ٧
ا ١+ ه ٥+ ب ٢+ ج ٣+ ه ٥+ د ٤ = ٢٠



مامۆستا جەعفەر

ک ٢٠+ ه ٥+ ن ٥٠ = ٧٥
ح ٨+ ی ١٠+ س ٦٠+ ا ١+ ب ٢ = ٨١
٥١+ ٣٥٥+ ٤٦٤+ ١٢٠٧+ ٧+ ٢٠+ ٧٥+ ٨١= ٢٢٦٠

کەواتە ئەمەش هەڵەیە و هیچ حسابێکمان بۆ دەرناکات، بەڵام بۆ ئەوەی بابەتەکە زۆر دوور و درێژ نەکەمەوە و سەر لە خوێنەریش تێک نەدەم، من تەنها دوو وشە دەهێنم و ڕوونی دەکەمەوە کە هەڵەکە لە کوێدایە و سالمیش مەبەستی لەم وشەیە بووە نەک ئەو نیوە بەیتەی کە دکتۆر عوسمان دەشتی هێناویەتی و دەڵێت بەپێی حیسابی ئەبجەدی ئەمە دەکاتە ئەو ساڵە. وشەی (بەخشش) و (حیساب) بەپێی ڕێنووسی نوێی کوردی کە دکتۆر عوسمان نووسیویەتی.

(بەخشش):
ب ٢+ ه ٥+ خ ٦٠٠+ ش ٣٠٠+ ش ٣٠٠ = ١٢٠٧
(حیساب):
ح ٨+ ی ١٠+ س ٦٠+ ا ١+ ب ٢ = ٨١
١٢٠٧+ ٨١= ١٢٨٨ی کۆچی، بەرامبەر بە ساڵی زایینی دەکاتە (١٨٧١).

بە ڕێنووسی کۆنیش بەم شێوەیە:
(بخشش):
ب ٢+ خ ٦٠٠+ ش ٣٠٠+ ش ٣٠٠ = ١٢٠٢
(حساب):



ح ٨+ س ٦٠+ ا ١+ ب ٢ = ٧١

١٢٠٢+٧١= ١٢٧٣ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی (١٨٥٦)ی زایینی دەکات.

کەواتە: لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دکتۆر کەمال فوئاد دەڵێت: ساڵی ١٢٧٠-١٨٥٤ دەکات هەڵەیە، هەر ئەم ساڵە کۆچییەی دکتۆر کەمال باسی دەکات بەرامبەر بە زایینی دەکاتە ساڵی (١٨٥٣)، چونکە ڕۆژەکانی ساڵی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی زایینی وەکو یەک نییە، بۆیە ساڵێک یان دوو ساڵ جیاوازی دەبێت، ئەمەش بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ زۆرە، چونکە ساڵێک دوورمان دەخاتەوە لە مێژووی ڕووداوێک و هەڵەمان پێ دەکات لە ڕووی مێژووییەوە، من ئەو ساڵانەی بەراوردم کردوون، لە ڕێگەی بەرنامەیەکی ئەلکترۆنی کۆمپیوتەرییەوە بووە کە لە برای بەڕێزم مامۆستا سدیق ساڵحم وەرگرتووە، سوپاسی دەکەم.

هەروەها دکتۆر عوسمانیش دەڵێت: ساڵی ١٢٨١-١٨٥٤ی زایینییە، ئەمەش هەڵەیە، ساڵی ١٢٨١ بەرامبەر بە ساڵی (١٨٦٤)ی زایینییە. جگە لەوەش دکتۆر دەڵێت: ساڵی نووسینەوەی ئەم دەقە (١٢٨١) دەکات، یان لێکدانەوەکەی بەو شێوەیە بووە، کەچی لێکدانەوەکەی ئێمەش بەپێی ئەو ڕێنووسەی بەڕێزیان نووسیویانە و دایان ناوە- لێکمان داوەتەوە، ئەو ساڵەی دکتۆر دایناوە، هەڵەیە و ساڵەکەی ئێمەش- ساڵی (١٢٨٨-١٨٧١) دەکات، هەروەها بە ڕێنووسی کۆنیش دەکاتە (١٢٧٣-١٨٥٦).

لەم لێکدانەوەماندا بۆمان دەردەکەوێت کە مامۆستا عوسمان دەشتی کەوتۆتە هەڵەیەکی مێژوویی گەورەوە، بەپێی ڕێنووسی نوێکەی خۆی (٧) ساڵ دوای ئەو ساڵە دەکات، بە ڕێنووسی کۆنیش (٨) ساڵ جیاوازی کەمیی هەیە.

ئەوەی ماوە بیڵێم ساڵی مردنی سالمی شاعیرە، چونکە ئەم لێکدانەوەیە خاڵێکی گرنگی تێدایە بۆ ساغکردنەوەی ساڵی وەفاتی سالم، دکتۆر عوسمان لە بابەتەکەیدا دەڵێت: (سالم هەر لە سلێمانیداو لە ساڵی (١٨٦٩) دا کۆچی دوایی کردووە، مەزاری گۆڕەکەی لە گردی سەیوانە...).

بۆ ئەم ساڵی مردنەی سالم دەبێ بڵێین: ئەگەر سالم ساڵی ١٨٦٩ی زایینی وەفاتی کردبێت؟!

دەبێ بە دوو شێوە ئەم لێکدانەوەیە بکەین:

١- بەپێی ڕێنووسی کۆن کە لێکدانەوەکەمان کردووە، ئەوا سالم (١٣) ساڵ پێش مردنی ئەم قەسیدەی نووسیوە.

٢- ئەگەر بەپێی ڕێنووسی نوێی کوردی حساب بۆ


(١٧٢)

بازبرقی حسنی دولبر سوتاندی مزرعه و کاشت    یاران علاجی من کەن ئەم مادە هوشو بنداشت

دوینی لطرفی صحرا ابور دلە بوسمی جاشت    بادی صبا زماهم طرفی نقاب برداشت

کالشمس فی الضحایا تطلع من الغمامة

هرگز لە باغی عمرم غنچەی مرادی نشکفت    سوتا لبرقی محنت شاخی مرادی من کفت

دوینی بە مثلی زلف دولبر لەجوابما شفت    گفتم زعشق رویت اندر ملامتم گفت

والله ما رأینا حبا بلا ملامة

هرگز لەصبحی بخت آشی مرادنەبودم    دنیا لگل منی زار ولای دوشمنە هم بود دەم

جە وری زمانە بومن یک ذرە قط نبوکەم    هرچندە آزمودم از وی نبود سودم

من جرب المجرب حلت به الندامة

حقا لە بزمی مستان هرتوی حریفی دیرین    سادەی ورە لەروی ناز ای زلف بو عنبرین

لە بزمی خاصی سالم بنیادکە جیشن و آیین    حافظ چو طالب آمد جامی زجام زرین

حتی یذوقه منه کأسا من الکرامة

بە کومەکی یزدان هەلبژاردەی دیوانی سالم تەواو بو بە قەلەم بندەی بێ نەوا

ماموستا: نجم الدین ملا، لە شاری سلیمانی لە شەوی پینجشەمی

١٨ی ربیع الأول ١٤٥٩ﻫ رێکەوتی [٢٥] نیسانی ١٩٤٠م

هیوام وایە خوێندەواران لە تاریکی نوسندەکەم ببورن

چونکە لە وختیکی پریشانی دبی ذوقی دانوسیومەتەوە



کەمال فوئاد

لێکدانەوەکەمان بکەین، ئەوا سالم ساڵی (١٨٦٩)ی زایینی وەفاتی نەکردووە، چونکە بەپێی ڕێنووسی نوێی کوردی ساڵی نووسینی ئەم قەسیدەیە، ساڵی (١٨٧١)ی زایینییە، واتە: (٢) ساڵ دوای ئەو ساڵەی بۆ وەفاتی سالم دانراوە، قەسیدەکە نووسراوە.

هەروەها ئەمین زەکی بەگیش لە کتێبی (تاریخی سلێمانی وە وڵاتی) و لە لاپەڕە (١١٧) دا دەڵێت: (لە ساڵی ١٢٦٧ی هیجری دا والی نامیق پاشا عبدالله پاشای بانگ کردە بەغداد و مەحفوزەن ناردی بۆ ئەستەمول و میر لیوایەکی تورکی، کە ئیسماعیل پاشایان پێ ئەگوت، ناردە سلێمانی و بەم تەرحە ئیمارەتی بەبەی، لە دوای دووصەد ساڵێک حکومەت، بە تەواوی لەناوچوو (١٢٦٧ هـ- ١٨٥١ م)).

ئەگەر ئەم قسەیەی ئەمین زەکی ڕاست بێت، ئەوا بەپێی ڕێنووسی کۆن کە ساڵی ١٨٥٦ی زایینییە و سالم قەسیدەکەی نووسیوە بۆ عەبدوڵڵا پاشا، دەبێ عەبدوڵڵا پاشا (٥) ساڵ لە دەرەوە بێت، سالمیش دوای (٥) ساڵ لە دەربەدەری عەبدوڵڵا پاشا و هاتنەوەی بۆ بەغدا ئەم قەسیدەی نووسی بێت.

ئەگەر بە ڕێنووسی نوێی کوردی لێکی بدەینەوە، ئەوا دەبێ سالم نەمردبێت و عەبدوڵڵا پاشا (٢٠) ساڵ لە دەرەوەی سلێمانی بووبێت، سالمیش دوای (٢٠) ساڵ ئەم قەسیدەی نووسی بێت.

ئەوەی ڕای من بێت لە بارەی ئەم قەسیدەیە و ساڵی لێکۆڵینەوەکەمان، ڕێنووسی کۆنە نەک ڕێنووسی نوێ، چونکە ناکرێت دوای بیست ساڵ لە دەربەدەری عەبدوڵڵا پاشا ئەو قەسیدە


بسم الله الرحمن الرحیم



نووسرابێت، دەبێ ڕێنووسی کۆن بەکار بهێنین بۆ لێکدانەوەکەمان، بەیتەکەش بەم شێوە بنووسین تەواوتر دەردەچێت:

ئەهلی دانش، حاتەمی (بخشش)، بە ئەبجەدکەن (حساب)

با نەڵێن: کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە

ئەمەش بۆ خوێنەری ئاگادار دەبێت، بەڵام بۆ هەموو خوێنەر دەبێ بەیتەکە بە شێوەی ڕێنووسی نوێی کوردی بنووسین و لە سەر هەردوو وشەکە پەراوێز دابنێین و ئاماژەی پێ بکەین و ڕوونکردنەوەی تەواو بنووسین.

لە کۆتاییدا دەستخۆشی لە دکتۆر عوسمان دەشتی و مامۆستا جەعفەری خۆشەویست دەکەم بۆ ئەو لێکۆڵینەوە ورد و درشتەیان و خستنە سەر ڕێی منیش بۆ لێکدانەوەی ئەو بەیتەی سالم و ڕاستکردنەوەی ئەو ساڵەی نێو قەسیدەکەی سالم، تەمەندرێژی و لەشساغی بۆ دکتۆر کەمال فوئاد و تەواوی ئەوانەی لە پێناوی ئەدەبی کوردی کۆندا بە ڕاستگۆیانە و بێ هیچ مەبەست و هۆیەک ماندوو دەبن و خزمەتی زمان و ئەدەبی کوردی دەکەن بێ جیاوازی.

**سەرچاوەکان:**

١- لە پەراوێزی دوو قەسیدەی (سالم) دا (تێکست و لێکۆڵینەوە): د. عوسمان دەشتی، گۆڤاری ئەکادیمی (گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی)، ژمارە ١٧ی ساڵی ٢٠١١، لاپەڕە (١٠٩-١٢٦).

٢- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی: محەممەد ئەمین زەکی بەگ، ڕەفیق ساڵح لە کۆی بەرهەمەکانیدا ئامادەی چاپی کردووە، بەرگی سێیەم، بنکەی ژین، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان- سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە (١١٧).

٣- بەرنامەی ئەلیکترۆنی ساڵنامەی کۆچی و زایینی کۆمپیوتەری.



# محەمەدی مەلا کەریم،
# لەسەر دیوانی سالم بۆ
# ڕۆڤار دەدوێت



**لەم چاوپێکەوتنە کورتەدا کە تایبەت بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار ئامادەکراوە، محەمەدی مەلا کەریم، باس لە ساغکردنەوە و چاپکردن و پاکنووسکردنی دیوانی سالم دەکات، ئەو دیوانەی کە باوکی (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)، پێش زیاتر لە ٣٠ ساڵ، بە هاوکاری هەردوو کوڕەکەی (فاتیح و حەمە) کاریان لەم دیوانەدا کردووە، بەڵام بەهۆکاری جۆراوجۆر، تا ئێستا ئەو دیوانە چاپ نەکراوە، ڕەنگە خوێنەر بپرسێت، بۆ ئەو دیوانەی سالم تا ئێستا چاپ نەکراوە؟ هۆکار و ڕێگرییەکانی چی بوون؟ دیوانەکە چەند لاپەڕەیە و چەند بەش و شیعر لە خۆ دەگرێت؟ چ دەزگایەك چاپی دەکات؟ ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تر سەبارەت بە دیوانی سالم، مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لەم دیمانەیەدا وەڵامیان دەداتەوە.**

## سازدانی: بەڕێوەبەری نووسین

***بەهەشتیی باوکتان، زیاتر کاری لەسەر چ دیوانە شیعرێکی شاعیرانی کلاسیکی کوردی دەکرد، کێ ئەو دیوانانەی بۆ هەڵدەبژارد و چۆن و بە چ شێوەیەك چاپتان دەکرد لە بەغداد؟**

-ئیشەکانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی باوکم لەبواری ساغکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردیدا، بەو ئاڕاستەیە بوو کە خۆی زیاتر حەزی پێدەکرد، هەربۆیە دیوانی بێسارانی، مەحوی، مەولەوی، نالی، سالم، حاجی قادری کۆیی، لەگەڵ کاکە فاتیحی برام ساغیان کردەوە و پاکنووسیان کرد و بەدواداچوونیان بۆ کرد، دیارە منیش کەم تا زۆر بەشداریم دەکرد لەو ساغکردنەوانەدا، ئیتر ئەم شێوازە لای خەڵکیی چەسپاو وای لێهات لە شارەکانی کوردستانەوە خەڵکی دەستنووس و دیوانی شاعیرانی بۆ باوکم دەنارد بۆ ئەوەی ساغی بکاتەوە و پەراوێزی بۆ بنووسێت، بەتایبەتیش لەو کاتانەی کە لە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دادەنیشت و دەرفەتی نەبوو بگەڕێتەوە بۆماڵەوە، هەر لەوێ لە ژوورەکەی خۆی دادەنیشت کاری لە دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا دەکرد و دواتر من و کاکە فاتیح پێیدا دەچووینەوە و دەسکاریمان دەکرد، ئەو سەیری دەکرد و دواتر دەماننارد بۆ چاپخانە، ئەمە شێوازی هەڵبژاردنی ئەو دیوانانە بوو، دیارە باوکیشم هەر ئەمە ئیشی نەبوو، بەڵکو مامۆستا بوو لە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و سەدان مامۆستای ئاینی گەورە لەسەر دەستی ئەو وانەی فیقە و شەریعە و وانەی مەلایەتییان دەخوێند، سەبارەت بەچۆنیەتی چاپکردنیشی ئەو کات لە بەغدا وەک ئێستا چاپخانە پێشکەوتوو نەبوو، بەڵام لە چاپخانە کارەکانمان دەکرد و خۆشبەختانەش ئەو دیوانانە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە کتێبخانەکان نەدەمان و دەستاودەستیان پێدەکرا.

***باسی دیوانی بێسارانی دەکەن کە پاکنووستان کردبێت لەگەڵ باوکت و کاکە فاتیحدا، بەڵام چاپ نەکراو دەنگۆیەك هەیە لێتان ونبووبێت و تا هەنووکەش چاپ نەکرا، ئەمە ئیهمالیی ئێوە نەبوو؟**

-بەڵێ زۆر ڕاستە، ئیهمالی پێوە دیاربووە، چونکە ئەوکات باوکم وابزانم لە هەشتاکاندا بوو، دیوانێکی زۆر جوانی بێسارانی ساغکردەوە و پێیداچووەوە و من و کاک فاتیحیش بۆمان نووسییەوە، بەڵام بەداخەوە بە دەستنووسیی ماوەتەوە و تا هەنووکە چاپ



نەكراوە و فەوتا، ئێستاش نازانین چی لێ بەسەرهات و کەوتە کوێوە، ئێستاش دەڵێم بریا باوکم ئەو کات خۆی یەکلابکردایەوە و وەک دیوانی نالی و مەحوی و مەولەوی و ئەوانی تریش، بە زوویی چاپی بکردایە، بـەڵام بیرمان نەچێت، خەڵكی تر هەبووە دیوانی بێسارانی چاپکردووە، بۆ نموونە حەکیمی مەلا ساڵح دیوانی بێسارانی چاپ کردووە لە ئێران، بەڵام ئەوەی باوکم زۆر جیاواز بووە لەگەڵ ئەوەی کاک حەکیمدا، باوکم پەراوێزێکی باش، وردەکاری شیعرەکان، زاراوە و ئیدۆم و زۆر شتی تری بۆ شیعرەکانی بێسارانی نووسی بوو.

*** چۆن بیرتان لە دیوانی سالم و بێسارانی و مەولەوی و شاعیرانی تری کلاسیکی کوردی کردەوە؟**

-وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، باوکم بەرنامەیەکی تایبەتی نەبوو بڵێت فڵان شاعیری کلاسیک ساغدەکەمەوە، هەرچی شیعر و بەرهەمی شاعیر بگەیشتایە دەستی، ساغی دەکردەوە و لەسەری دەنووسی، ئەمەش وەک هیوایەتێکی تایبەتی خۆی، ئەمەی ئێستاش لە بەردەستی مندایە دیوانی (سالم) ە و تا ئێستا چاپ نەکراوە، لە هەشتاکاندا لەگەڵ کاک فاتیحی برام ساغیان کردووەتەوە، ئێستا من پێیدادەچمەوە.

***ئێستا دیوانی سالم گەیشتووتە کوێ و بڕیارە کەی و لە کوێ چاپی بکەیت، چونکە تۆ ماوەیەکی زۆرە باس لە دیوانی سالم دەکەیت، بەڵام تا ئێستا نە هیچت لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا لێ بڵاوکردۆتەوە، نە خوێنەریش دەزانێت ئەو دیوانەی سالم چۆنە و لەسەر چ بنەمایەك کارتان تێدا کردووە؟**

- (بە پێکەنینەوە)، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە هەر بەردەوام ڕۆژانە کار لە دیوانی سالمدا دەکەم، خەون بەوەوە دەبینم تەندروستیم ڕێگەم بدات دیوانی سالم بە چاپکراوی ببینم، هەرچەندە باری تەندروستیم ڕێگەم نادات، بەڵام بەو هیوایەم لە کۆتایی ئەمساڵدا خوێنەر چاپی دیوانی سالم ببینێت، وەک سەرەتایەکیش لەگەڵ بنکەی ژین قسەمان کردووە و بڕیارە لەوێ چاپی بکەین، بە سوپاسەوە دەزگای سەردەم و چەند شوێنێکی تریش هاتوون بە دەممانەوە بۆ چاپکردنی ئەم دیوانەی سالم، بەڵام من هێندەی گرنگە بەلامەوە چاپێکی جوانی بێ کەموکورتی بکەم، گرنگ نییە بەلامەوە لە کوێ چاپی بکەین، تۆ ڕاست دەکەیت لە چەندین گۆڤار و چاوپێکەوتندا باسی سالم و دیوانەکەیم کردووە، بەڵام تا هەنووکە بڵێین چی ئەو دەرفەتە نەڕەخساوە چاپ بکرێت، خۆت باری تەندروستیم دەزانیت کە ماوەی پێنج ساڵە من لەسەر جێگە کەوتووم، بەڵام بەردەوامیش هەرکات دەستم قەڵەمی گرتبێت چوومەتەوە بۆ لای دیوانەکە و کارم تێدا کردووە، لە بارەی شێوازی کارکردنیش دەمەوێت ئەوەبڵێم، ئەمە کاری کاکە فاتیح و باوکمە، بەڵام من بەس بەسەریدا دەچمەوە و ساغی دەکەمەوە.

***دوای ئەو هەموو ساڵە لە کارکردن لەم دیوانەدا، تا ئێستا چیتان لە دیوانەکەی سالم ساغکردووەتەوە و چ شتێکی تازەتان تێدا بینیوە کە لە شیعری**





**شاعیراندا نەبێت، چۆن شیعرەکانتان ڕێکخستووە، لەسەر چ بنەمایەك؟**

– بێگومان ئیشی زۆرم لە شیعرەکانی سالم کردووە، وەک پێشتریش ئاماژەم پێدا، ئێستا ئێمە لە قۆناغی کۆتایی دیوانەکەداین، شیعرەکانیشم بە پێی پیتی ئەبجەدی داناوە، ئێستا لە پیتی (س)داین، بەڵام مەرج نییە شیعرەکان هەموویان وەک یەک بن، بۆنموونە لە پیتی ئەلفدا شیعری زۆرە، بەڵام لە پیتی (ب) ڕەنگە چەند شیعرێکی کەمی هەبێت، ئیتر ئێمە بە پێی ئەو تایبەتمەندیانە و تێگەیشتن لە شیعرەکانی سالم دامانناوەتەوە، پێم وابێت ئەمەش بنەمایەکی دروستە بۆ خوێندنەوەی شیعری سالم، سەبارەت بە جیاوازی سالمیش لەگەڵ شاعیرانی تری کلاسیکی کوردی، پێم وابێت جیاوازی ئاسمان و ڕێسمانە، بەتایبەتیش لە تایبەتمەندی شیعرییدا.

***بە پێی ئەزموونی خۆتان لە شیعری کلاسیکی کوردی، بەتایبەتی شیعری شاعیران (نالی، مەحوی، سالم، مەولەوی) جیاوازییان لە چیدایە و تایبەتمەندییان لە چیدایە، بۆ نموونە جیاوازی سالم لەو سێ شاعیرەی تر چییە و لە چیدا خۆی دەبینێتەوە؟**

– بەبڕوای من نالی شاعیرێکی مەلایانە بوو، خوێندەوارییەکی زیرەکانەی دەوێت بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتن لە شیعرەکانی، سالم ئاسانترە، مەحوی شاعیرێکی لوسە و زوو دێت بەدەستەوە، ئەمە تێگەیشتنی منە بۆ ئەو شاعیرانە و ئەو ماوە زۆرەی کارم لەگەڵ دیوانەکانیاندا کردووە، کە دەڵێین سالم ئاسانترە، مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین قووڵ نییە و شیعری ڕووکاری بنووسێت، نەخێر، مەبەستمان ئەوەیە چنینی وشە و داڕشتن و لوغز لە شیعرەکانی ئەمدا، بەراورد بە نالی و مەحوی زۆر کەمترە، بە تایبەتیش کاتێک ئەو شیعرانەی دەخوێنیتەوە کە لە دیوانەکەیدا هەیە، ئەو ڕاستییەت بۆ دەردەکەوێت.

***ئەی سەبارەت بە ژیانی سالم و ساغکردنەوەی مێژووی لەدایکبوون و مردن و ژیانی کۆمەڵایەتی، ئایا ئەو شتانەت لەم دیوانەدا ساغکردووەتەوە، چونکە زۆر قسە لەسەر ژیانی دەکرێت، لە هەمان کاتیشدا ژیانی سالم لەچاو شاعیرانی تردا زۆر بە کەمی دەزانرێت؟**

–لە ڕاستیدا ئەوە کارێکی زۆر قورسە، من ڕێزم هەیە بۆ هەندێ نووسەری تر کە بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردیان ساغکردووەتەوە، هەر لە خۆیانەوە دەڵێن فلان شاعیر گۆڕەکەی لە فلان شوێنە، یان فلان ساڵ و ڕۆژ لە دایک بووە و لە فلان شوێن مردووە، ئەمە بەلای منەوە زۆر واقیعی نییە و هیچ بەڵگەیەکی زیندوو لەبەردەستدا نییە، بۆیە من ئەوەندەی خەریکی شیعرەکانی ئەوم، ناچمە وردەکاری ژیانی سالم، مەگەر ئەوەندە نەبێت بەڵگەی زیندووم لەبەردەستدابێت، بۆئەوەی نەکەومە هەڵەی میتۆدییەوە، ئەگەر سەیریش بکەین زۆربەی توێژەرەوانی ئەو بوارە، زۆر بە کەمی قسەیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی سالم کردووە، ڕەنگە لە چەند دێڕێک زیاترمان دەستنەکەوێت، تەنانەت بۆ مێژووی لەدایکبوون و مردنیشی، بە هەمان شێوە بۆیە ئێمە ناتوانین هەر لە خۆمانەوە شتی بۆ داتاشین و بڵێین وا ژیاوە و وا مردووە.

***دەڵێن کۆمەڵێکی زۆر کتێبی باوکتان ئێستاش لە بەغدایە، لەو کتێبانەش زۆر کتێبی دانسقەی تێدایە لەسەر شاعیرانی کلاسیکی کوردی، کە ڕەنگە تا ئێستا نەبینرابێت؟**

– بەڵێ ڕاستە، بێگومان باوکی ڕەحمەتیم هەرلەوێش لە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بەشێکی زۆری کتێبی دانسقەی هەبوو، کە زۆر جار من لە خزمەتیدابووم و پێی دەوتم ئەم کتێبە بخەرە ئەوێ و ئەو کتێبەم بۆ بێنە و ئەوەی تریان لاببە، خۆی دەیزانی لە کوێدا دایدەنێت و شوێنەکەی لە کوێدایە، هەرگیز بۆ کتێبێک دانەدەما، یەکسەر دەیوت فلان کتێب لە فلان شوێنە بۆم بێنە، بەڵام ئێستا بەداخەوە بەشێکی زۆری ئەو کتێبانە لە کتێبخانەی مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دزراون و نەماون، کتێبەکانیش کتێبی نەحو صەرف و بەلاغە و چەندین بواری تری ئەدەبی کلاسیکی کوردی بوون.

***ئەم دیوانە شیعرییەی سالم، شیعری بڵاونەکراوەی ئەو شاعیرەی تێدایە؟**

–بەڵێ، بەشێکی زۆری ئەو شیعرانە بڵاونەکراوەن، ئێ دەبێت ئەوەش بزانین ئەمە یەکەمین دیوانی (سالم)ە بەو قەبارە گەورەیە، کە ڕەنگە خۆی لە زیاتر لە ٤٠٠ لاپەڕە بدات، ئەمە جگە لە ماناکردنی وشە شیعرییەکان و شیکاری هەندێ دێڕ و نووسینی شیعریی، بەبڕوای من ئەمە دەبێتە یەکێک لە دیوانە باشەکانی شیعری سالم لە کتێبخانەی کوردیدا، بەو هیوایەی تەندروستیم ڕێگەم بدات لە کۆتایی ئەم ساڵدا تەواوی بکەم، لە سەرەتای ساڵی نوێدا چاپی بکەم و ئاشنابێت بە خوێنەران.





# سالم و چەپکێک لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی

ڕێبوار جەواد




بۆ یەکەمینجار لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا و ئەو کاتەی بارودۆخی سیاسی کوردستان و پەیوەندی نێوان کوردستان و بەغدا لەبارێکی نائاساییدا بوو، لەو کاتانەدا ئێمە لە زانکۆی بەغدا دەمانخوێند و پەیوەندییەکی توندوتۆڵمان لەگەڵ کۆمەڵێک ڕۆشنبیر و نووسەری دیاری کورد هەبوو، لەوانە مامۆستایان (مەسعود محەمەد، د.کەمال مەزهەر، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کاکە حەمەی کوڕی، محەمەد شێخ عەلی قەرەداخی، عەبدولڕەزاق بیمار و چەندانی تر)، زۆربەی دانیشتن و سەردانی کردنی ئەم زاتە گەورانەی کوردیش بۆ دەسکەوتنی سەرچاوە و بابەتی هەمەلایەنە بوو لەسەر ئەدەب و مێژووی کورد و ساغکردنەوەی هەندێ ڕاستی لە بیرکراو لەسەر نەتەوەکەمان، ئەم پەیوەندییە درێژەی کێشا، تا سەرەتای ٢٠٠٠ و دواتریش پرۆسەی ئازادی عێراق.

بیرمە جارێکیان لە ماڵی بەهەشتیی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، پرسیاری هەندێ کەشکۆڵ و شیعری ساغنەکراوە و بڵاونەکراوەی (سالم)م لە کاکە حەمەی مەلا کەریم کرد، ئەویش خۆی ئاسایی بە پێکەنینەوە وتی "ئەگەر تەمەن باقی بێت لە داهاتوویەکی نزیکدا دیوانێکی پاکی سالم ساغدەکەینەوە و بە خوێنەری کوردی ئاشنا دەکەین، هەرخۆشی ئەو کاتە وتی زیاتر لە ١٠ ساڵە بەدوای ساغکردنەوەی (سالم)ەوەم، ئێستا دوای نزیکەی ٢٥ ساڵ هێشتا ئەو دیوانەی (سالم) بڵاونەبووەتەوە و خۆشبەختانە لەم ڕۆژانەدا بیستمان کە دیوانەکە لە قۆناغی کۆتایی نزیک بووەتەوە، ئەگەر بەهەڵەش نەچووبم، هەر ئەو کاتە چەندینجار مامۆستا محەمەد قەرەداغی و مەلا عەبدولکەریم و کاکە حەمە گفتوگۆ و دیالۆگی جۆراوجۆریان لەسەر دیوانی سالم هەبوو، کە دواجار دەرفەت ڕەخسا مامۆستا قەرەداغی خوا تەمەنی درێژ بکات، ئیشی باش و قووڵی لەسەر ئەم شاعیرە ناودارە کرد.

یەکێک لەو هەوڵانەش کە شایەنی هەڵوێستە لەسەر کردنە، کتێبی (بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم و چەپکێک شیعری بڵاونەکراوەی سالم)ە، کە لە دوو توێی ٢٥٠ لاپەڕەدا لە ساڵی ٢٠١٠ لە دەزگای ئاراس لە شاری هەولێر چاپ بووە، بەدەر لەو پێشەکییە پوخت و پڕ زانیارییەی مامۆستا قەرەداخی، دیارترین گەوهەری ئەم کتێبە بڵاوکردنەوەی ئەو هەموو شیعرە جوان و ئاست بەرزەی (سالم)ە کە پێشتر ڕەنگە خوێنەر نەیبینیبێت، بۆ ئەم ساغکردنەوە و نووسینەوەی شیعرانەش، قەرەداغی پشتی بە چەندین کەشکۆڵی گرنگ بەستووە، لەوانە (کەشکۆڵی تۆفیق، کەشکۆڵی مەلا عەبدوڵڵای قزڵجی، کەشکۆڵی گوڵزاری بەهار، کەشکۆڵی سەید محەمەد، کەشکۆڵی نەناسراو، لەگەڵ چەند کەشکۆڵێکی تردا) ئەمە جگە لەوەی بەشێکی سەرەکی تەرخانکردووە بۆ پاشکۆیەک بۆ شیعر و هەندێ شیعری بڵاونەکراوەی نالی، کە بەبڕوای من ئەم ساغکردنەوە و لەسەر نووسینە لەسەر شیعری نالی، بە یەکێک لە نووسینە قووڵ و پڕ زانیارییەکان لەسەر ئەو شاعیرە ئەژمار دەکرێت، بریا مامۆستا قەرەداغی ئەو بەشەی شیعری نالی بە جیا چاپ بکردایە و ئەم کتێبە تایبەت بوایە بە سالم، بەهەرحاڵ ئەمە هیچ کۆسپێک نییە لە سەنگینی و گەوهەری بەنرخی ئەم کتێبەی سالم و شیعرە بڵاونەکراوەکانی.

دیارە لە پێشەکی ئەم کتێبەشدا بەچەند لاپەڕەیەک

مامۆستا قەرەداغی وەڵامێکی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمی داوەتەوە لەسەر دیوانی سالم و هەندێ سەرنجی کاکە حەمە لەسەر لێکچوونی ئەو شیعرانە و شیعری نالی، بەڵام ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی بۆچوونی جیاوازی ئەدەبی و شتێکی واریدە لە دونیای ئەدەبیدا. چونکە بۆ مێژوو دەڵێم، خێزانی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و هەردوو کوڕەکەی کاکە حەمە و کاک فاتیحی خوالێخۆشبوو، خزمەتێکی بێ ئەندازەیان بە کتێبخانەی ئەدەبی کوردی و شیعری کلاسیکی کوردی کردووە، ئەمە جگە لەوەی هەمیشە ماڵەکەیان تەکێی خوێندەواران و قوتابیان و فێرخوازانی کورد بووە، ئەو دیوانانەشی کە ئەم باوک و دوو کوڕە ساغیان کردووەتەوە، بەتایبەتی مەحوی و نالی و بێسارانی و حاجی قادری کۆیی، گەوهەرێکی مەزنی ئاسمانی ئەدەبی کوردین، مەبەستمە بڵێم، ئەگەر کاکە حەمە ڕەخنەیەکی هەبێت لە دیوانی سالمەکەی مامۆستا قەرەداغی، یان بە پێچەوانەوە هیچیان لە توانا و لێهاتوویی و خەمخۆری هەردوولایان کەم ناکاتەوە.

یەکێک لەو شیعرە جوان و نایابانەی سالم لەم کتێبەدا، ئەو شیعرە درێژەیەتی کە تا ئێستا بڵاونەبووەتەوە و سالم بۆ عەبدوڵڵا پاشای بابان نووسیویەتی، لە شیعرەکەدا ئاستێکی بەرزی زمان و وێنە و وەسفی دیمەنی شیعری تێدا خراوەتە ڕوو، دیارە عەبدوڵڵا پاشای بابان، کوڕی مەحموود پاشا بووە، برای مەحموود پاشای بابان بووە، مێژووی فەرمانڕەوایەتی و هەوراز و نشێوییەکانی ژیانی نزیک بووە لە سەردەمی سالمەوە، هەربۆیە ئەم شیعرەی بۆ نووسیوە کە (٤٢) بەیتە، باسی گەڕانەوەی عەبدوڵڵا پاشا دەکات لە ڕۆمەوە بۆ سلێمانی، لێرەدا چەند کۆپلەیەکی ئەو شیعرە بڵاودەکەینەوە کە بۆ یەکەمینجار مامۆستا قەرەداغی لە کتێبەکەیدا و لەلاپەڕە (١٠٤-١٠٧) بڵاویکردووەتەوە.

**تیرۆشی دیمە گوزەشت و عەهدی نیسان هاتەوە**
**بولبولی بێ دڵ لە دەوری گوڵ بە ئەفغان هاتەوە**
**سەختگیریی کرد سەرما ئەگەر وەکو ئەفراسیاب**
**یادی نەورۆزی بە میسلی (پوردستان !) هاتەوە**
**لەشکری گوڵ جوملە خەندانن دەڵێن: سەرما شکا**
**تا سولەیمانی صەبا بۆ دێوی زستان هاتەوە**
**باغە پەژموردەی خەزان و خوڕەمی ئەوقاتی حووت**
**ماهی نەورۆزی بە عەکسی ماهی ئابان هاتەوە**
**بای شەماڵ هێنایە جونبوش قامەتی سەرووی سەهی**
**بۆ خیابانی چەمەن قومری بە ناڵان هاتەوە**
**سارە دڵدادەی شکۆفەی شاخساری طەرفی باغ**
**بێخود و ڕەققاص و سەرمەست و غەزەلخوان هاتەوە**



کەشکۆلی سەید محەمەد



شیعرەکە بەم ڕیتمە بەردەوام دەبێت لە چنینەوەی وشە و ڕستە و غەزەلی تایبەت بە هاتنەوەی عەبدوڵڵا پاشای بابان، لە هەندێ وشە و ڕستە و گوزارشتدا خوێنەر هەست دەکات ئەم ڕیتمە شیعرە هەمان شیعرەکانی پێشووتری سالمە، بەتایبەتیش لە شێوازی وەسفکردنیدا.

لە کۆتایی شیعرەکەشدا بەم چەند دێڕە کۆتایی پێدێنێت:

**طایری دەوڵەت (ببحەمداللە) بە ئەمری شەهرەزوور**
**موستەعیدد و خوڕەم و یازان و تازان هاتەوە**
**کەوتە ناو کەففەی کەرەم دووبارە خەرجی شەهرەزوور**
**طالیعی دەروێش و موفلیس بوو کە قائان هاتەوە**
**من بە شك دەمووت: نەجاتی کەی دەبێ پاشا لە ڕۆم؟**
**دڵ وتی: سالم یەقینت بێ بە قورئان هاتەوە**
**ئەهلی دانش (حاطمی بخشش) بە ئەبجەد کەن حساب**
**با نەڵێن کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە؟**

ئەگەر ئەم شیعرەی سالم بەراورد بکەیت بە زۆرێک لە شیعرەکانی تری ئەو شاعیرە، دەبینین لەسەر ئاستی شیعر و شێوازی وەزن و قافێ و ڕیتمی شیعریدا، لە شیعرە هەرە بەرزەکانی سالمە، بەتایبەتیش ئەم شیعرە بە جۆرێک لە شیعری ستایشکاری و وتنی بۆ پاشایەکی بابان ئەژمار دەکرێت، بەڵام سالم لەگەڵ ئەوەی خۆشی لەو بنەماڵەیە بوو، نەیهێشتووە ئەو هەستە شیعرییە و ئەو توانا شیعرییەی بە تەنها بە وەسف سەرف بکات، بۆیە جوانکاری شیعر و تەکنیکی بەرزی لە چنینی شیعرەکەدا بەکارهێناوە.

لە شیعرێکی تری بڵاونەکراوەی سالم و لەم کتێبەدا لە لاپەڕەی (١٢٠)دا بەناونیشانی (در وەصف والی یان لە ستایشی والیدا) لەو شیعرەشدا سالم وەسف و ستایشی والی دەکات، کە بێگومان والی بابانییەکانە، ئەم شیعرەش بە ئاستێکی بەرزی زمانەوانی و بە تەکنیکێکی باڵا نووسراوە، کە خوێنەر دەیخوێنێتەوە لە بندێڕ و شێوازی شیعرەکەدا هەست دەکەیت زۆر نزیکە لە ڕۆح و جیهانبینی شیعرەکانی تری ئەو شاعیرە، لە چەند دێڕێکی ئەو شیعرەدا سالم بەم شێوە دەست پێدەکات:

**مەهی دی هاتوچو ڕابورد شەوی دەی**
**دەسا دەی مەی بدەن ئەمجا پەیاپەی**
**خەلاصم کەن لە دەست غەم موطریب ئامان**
**بەدەنگی بەربەط و چەنگ و دەف و نەی**
**دەبێ ساقی لەمێ عیسا نەفەس بێ**
**بە نەشئەی موردەیی صەد ساڵە کا حەی**
**زومەڕڕە درەنگە صەحرا و بادە گولگوون**



هەتا کەی کا (پلی !) چەنگی دەخیل دەی؟
چە ڕەنگینە بە مەستیی ڕوویی ساقی؟
چە دلگیرە صەدای: هەی بێنە مەی هەی؟
عەجەب صەفوەت دەهێکە مەی حەقیقەت
لە دڵ بیروون دەکات: غەل و غەش و غەی
بە یەغما چوو هەمیسان طاقەت و هۆش
لە چاوی مەستی ساقیی ئۆف خوا وەی

بەم شێوەیە تا کۆتایی شیعرەکە بـەردەوام دەبێت، بێگومان شیعرەکەش درێـژە و تەنها مەبەستمان بوو ئەم چەند کۆپلەی لێ بڵاوبکەینەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر لەو هەست و سـۆزە شیعرەی سالم بگات، کە لەو شیعرە بڵاونەکراوەیدا نووسیوویەتی، کە پێم وابێت ئەم شیعرەش پێشتر لە کەم کەشکۆڵی شیعری کلاسیکی کوردی و شیعری سالمدا بەرچاو کەوتووە، بۆیە بڵاوکردنەوەی لەکتێبەکەی مامۆستا قەرەداغیدا هێندەی تری بایەخ و سەنگینی دەردەخات.

بەشێکی تری کتێبەکەی ئەم نووسەرە تەرخانکراوە بۆ شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم، ئەوانەی کە بە بەیتە تاک و جووتە بڵاونەکراوەکانی ئەژمار دەکرێت، لەم بەشەشدا نووسەر دەیان بەیتی جووت و تاکی سالمی بڵاوکردووەتەوە، کە پێشتر خوێنەر بەرچاوی نەکەوتوون، ئەمە جگە لەبڵاوکردنەوەی کۆمەڵێکی زۆر لە شیعری فارسی بڵاونەکراوەی سالم، کە ڕەنگە ئەم شیعرانە بە تەنها لای مامۆستا قەرەداغی خۆی هەبێت.

لایەنێکی تری ئەم کتێبە مامۆستا هەوڵی ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەیداوە، قسەکردنە لەسەر شیعری نالی مـەزن، کە لەم بەشەدا خوێنەر تام و چێژێکی زۆر تایبەت لەو شیعرانە دەبینێت، بە تایبەتیش نالی خۆی ئەو توانستە بەرزەی هەیە کە هۆش و بیری خوێنەر داگیربکات، هەرچەندە تا ئێستاش دەیان گومان و لێکچوون هەیە لە نێوان شیعری شاعیرانی کلاسیکماندا، بەڵام مامۆستا قەرەداغی بەساغکردنەوەی کۆمەڵێکی زۆر شیعر و دەستنووس و کەشکۆڵنامە، تا ڕادەیەکی زۆر گومانی لەسەر ئەو شیعرە لێکچوانەی شاعیرانی کلاسیک نەهێشتۆتەوە، یەکێک لەو شیعرانەش کە لەم کتێبەدا و لە لاپـەڕە ١٥٤ دا بڵاوکراوەتەوە و ساغکراوەتەوە و نووسەری کتێبەکەش شیکارییەکی جوانی بۆ شیعرەکە کـردووە، کە ئەویش شیعرێکی بڵاونەکراوەی (نالی)یە کە لە تارانەوە نووسیوویەتی و شیوەنێک بـووە بۆ ڕووخـانـی میرنشینی بابان نووسیوویەتی، کەبەم شێوەیە دەست پێدەکات:




کەشکۆڵی نەناسراو



بەدا ئەحواڵی ئەشخاصێ کە خاصەی موڵکی بابانن
لە بێدادیی فەلەك هەریەك سەراسیمە و هەراسانن
جەوانانی سوهاقەد بەسکە داماون بەبێ چیزی
لە ژێر باری غەما هەرجا لە خەمدا میسلی چەوگانن
لە بابانا گرفتارن پەرێشان خاطر و بێکەس
بە جەمعییەت سیە بەختانە وەك گوێسووی خوبانن
گەدان و بۆ گەدا دەرکانە وا ناکەن لەبەر بێ چیزی
وەکو (نەراد دانا) هەر لە فکری خانە بەندانن
لە زوڵمی چەرخی دوون پەروەر سەخی تەبعانی حاتەم دڵ
بەراهی کۆی دوونانا لەهەر سوو کاسەگەردانن
بە دەستی کەشمەکەش هەر سوو دڕا بەرگی خودئارایی
قەبای نۆکەر و ئاغا هەموو بێ چاك و دامانن
لە بابانا ئێستە چون قادەی نۆکەری، دۆغە
لە حەلقەی ئەهلی حەسرەتدا هەموو کەممو لە فنجانن.

دیارە ئەم شیعرەش یەکێکی ترە لە شیعرە درێژەکانی نالی، بەڵام من بە پێویستم زانی تەنها ئەو چەند دێڕەی دابنێم، خوێنەر خۆی دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەم کتێبە و تەواوی شیعرەکە بخوێنێتەوە، کۆتایی بەشی کتێبەکەش، نووسەر وێنەی ئەو دەستنووس و کەشکۆڵنامانەی داناوە وەک خۆی، بۆ ئەوەی خوێنەر وەک پشوویەک لە کۆتایی خوێندنەوەی کتێبەکەدا چاوێکیان پێدا بخشێنێت.

هیوادارم توانیبێتم چەند پەڕەگراف و سەرەقەڵەمێک لەسەر کتێبی بەرکوتێک لە خەرمانی شیعری سالم و چەپکێک لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی و پاشکۆیەکی دیوانی نالی بڵێم، دڵنیام ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە هەرە باشەکانی کتێبخانەی کوردی لەسەر شیعری سالم و شیعری بڵاونەکراوەی نالی، کە ڕەنگە وەک پێویست خوێنەری کورد ئاشنا نەبێت پێی، بەهیوای ئەوەی ئەم نووسینە کورتە، هاندەرێک بێت بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە و شیعرەکانی سالم.



# دیلێتی سالم و ئەڵماس خان لە شاری تاران دا

رێبین عوسمان

ئەگەر بە مێژووی ئەدەبیاتی کوردییدا گل ببینەوە، زۆرێك لە شاعیرانی کورد باسی دیلێتی و بەندی و بەندیخانە دەکەن لە سەرجەم بوارە جیاوازەکاندا، بەڵام دیلێتی ئەم دوو شاعیرە لە شاعیرانی دیکە جیاوازە، بۆیە بە باشم زانی هەندێك لەو بەیتە شیعرییانەی هەردوو شاعیر بەراورد بکەم و لە بابەتێکی وەها شێوەدا بیخەمە ڕوو.
ئەڵماس خانی کەنووڵەیی سەرهەنگی سوپای نادرشای ئەفشار بووە و لە جەنگی کەناری ڕووباری دیجلەدا شکستی خواردووە، هەر بەو بۆنەیەوە نادرشای ئەفشار گرتوویەتی و لە شاری تاراندا بەندی کردووە، ئەم شاعیرەش خاوەنی بەرهەمێکی زۆرە، بەڵام تاکو ئێستا بەرهەمەکانی بە پەڕاگەندەیی ماوەتەوە، بەندە لەگەڵ مامۆستا هەردەوێڵ کاکەیی و مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینی پاوەیی، زۆرێك لە بەرهەمەکانیمان گردوکۆ کردووەتەوە و ئامادەی چاپمان کردووە، ئەڵماس خانیش وەکو سالم لەنێو سێکوچکەی ئەردەڵاندا ناوی هەیە، سێکوچکەی ئەردەڵانیش بریتییە لە ئەڵماس خانی کەنووڵەیی و میرزا شەفیعی کولیایی و خانای قوبادی، ئەم سێ شاعیرە هاوتەمەن و نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا هەیە.
سالمی ساحێبقرانیش[1*] کە ئامۆزای موستەفا بەگی کوردییە، سالم لەگەڵ نالی و کوردییدا نامە گۆڕینەوە لەنێوانیاندا هەیە، بە سێکوچکەی بابانیش ناوبانگیان هەیە.
سالمی شاعیریش بە هەر بۆنە و باسێکەوە بێت، ماوەیەك لە شاری تاراندا بەدیل گیراوە یان ماوەتەوە، بەڵام من بەبۆنەی هەندێك لەو نامانەی کە بۆ موستەفا بەگی کوردیی نووسیوە، تیایدا زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت کە سالمیش ماوەیەك لە بەندیخانەکانی شاری تاراندا بەدیل گیراوە، هەر بۆیە دەڵێم: سالم لە شاری تاراندا دیل بووە.
لەبەر ئەوەی ئەڵماس خان لە ڕووی تەمەنەوە لە پێشترە و لە پێش سالمدا ژیاوە، سەرەتا هۆنراوەکانی ئەڵماس خان دادەنێم و هەندێك لە بەیتەکانی ڕوون دەکەمەوە.
ئەڵماس خان لە هۆنراوەیەکی دا دەڵێت:

**یاران دووستاخم، یاران دووستاخم**
**جە شار تاران، منیش دووستاخم**
**هامراز مەینەت، شەریک ئاخم**
**بەرگم قەڵاخەن، پەی یاران داخم**
**توفەیل غەمناک، شار تارانم**
**گیرۆدەی زەنجیر، شاه ئێرانم**

**بێ کەس و بێ وەر، بێ یار و یاوەر**
**غەریب بێ کەیف، جە عێل دەربەدەر**

ئەڵماس خان دەڵێت: یاران من دیلم، یاران من دیلم، لە شاری تاراندا منیش دیلم، هاوڕازی مەینەتی و شەریکی ئاخم، بەرگی من ڕەشە و بۆ یارانم بەداخم، بووم بە قوربانی خەم لە شاری تاراندا، بە زەنجیری شای ئێران گیرۆدە کراوم، ئێستەکەش بێ کەس و یار و یاوەر... نەناسراو و بێ تاقەت و بێزار و وەڕس، لە ئێلیش دەربەدەر کراوم...
سالمیش دەڵێت:

**لە زیندانا کە بێ هەمدەردم ئەمڕۆ**
**ئەسیری ناکەس و دڵ بەردم ئەمڕۆ**
**لە دارولوزنی دووریدا سەبا بوو**
**گەیاندی نامەیی هەمفەردم ئەمڕۆ**
**لە پام گەر بەندە، (دەرا)، وازە لە مەیلم**
**دڵم لاتە زەبوون و زەردم ئەمڕۆ**

سالمیش لە چەشنی ئەڵماس خاندا دەڵێت: لە بەندیخانەدا ئەمڕۆ کە من بێ هاودەرد و بێ کەسم، دیلی دەستی ناکەس و دڵی وەکو بەردە ئەمڕۆ... تا دەگاتە ئەوەی بڵێت: ئەگەرچی پێکانم بەند کراوە، ئەگەر دەرگا و دەروازەم بۆ واڵا بکرێت... دڵم بێ دەسەڵات و زەبوون و ڕەنگ و ڕووم زەرد هەڵگەڕاوە...
دیسانەوە ئەڵماس خان دەڵێت:

**جە سوب تا بە شام، گرینەن خدێم**
**ئاوات مەوازووم، من وە مەرگ وێم**
**پەشێو و ماتم، دەروونم زارەن**
**مەحبووس مەئیووس، بەرگم دەوارەن**
**پەی دووری وڵات، خاتر خەمینم**
**بەفران مەشۆ سەیل ئەسرینم**
**غەریب نەگۆشەی کونج شارانم**
**ئینتیزار وە دین، دیدەی یارانم**
**سنە نشینان، بنیشن وە شاد**
**غەریب تاران، بکەرۆن وە یاد**
**هەر کەس بواچۆ کە تاران خاسەن**
**ئەوە نە جوملەی خودا نەناسەن**

ئەڵماس خان دەڵێت: لە بەیانی تا بە نیوەڕۆ بەشی من گریانە، بە مەرگی خۆم ئاواتەخوازم، پەشۆکاو و

1 * تاکو ئێستا سێ شاعیرمان بەناوی (سالم)ەوە لە مێژووی ئەدەبیاتدا هەیە، سالمی ساحێبقران، سالمی سنە "شیخ موحەممەد سەلیم مەردۆخی"، سالم قهفرخ "سەیید موستەفا"، بڕوانە شاعیرانی کوردی فارسی گۆیی، (لا- ٣٨٦-٣٨٧).

بێ دەنگ و دەروونم زامـارە... دەست بەسەر و داماو و بەرگم ڕەشە وەکو دەوار (ڕەشمـاڵ)، ئەمەش لەبەر خاتری دووری وڵاتەکەمە کە خەمبارم،... تا دەگاتە ئەوەی ئەڵماس خان دەڵێت: ئەوانەی لە شاری سنەدان با بە خۆشی دابنیشن و بیری ئەوانە بکەنەوە کە لە شاری تاراندان، هەر کەسێکیش بڵێت: تاران چاکە، ئەوانە لە کۆمەڵەی خوا نەناسەکانن...
سالم دەڵێت:

**گلیەیی ناحەق مەکە، پرسی دڵم کە**
**ئەگەر بێ مەیلە؟ من نامەردم ئەمڕۆ**
**بەسروەی فێنکی بادی شەماڵت**
**بووە هاوین، لە ئاهی سەردم ئەمڕۆ**
**خۆشا، ئەگەر تۆ لە پەروازی وەکو مەل**
**ئەمن پابەندی بەندیی فەردم ئەمڕۆ**

سالم لەم چەند بەیتەدا کە وەڵامی کوردی ئامۆزای دەداتـەوە، دەڵێت: بەناحەق گلەییم لێ مەکە، لە دڵم بپرسە، ئەگەر لە تۆ بێ مەیلە؟! ئەوا من ئەمڕۆ نامەردم، ئەگەر سروەیەکی فێنکی بای شەماڵ لەلای تۆوە بۆمن بێت، لەبەر ئاهوناڵەی ساردی من ئەمڕۆ بووە هاوین، ئەگەر تەماشایەکی ئەم بەیتە بکەین سروەی بای شەماڵ کە فێنکە و ئاهوناڵەی ساردی هەناسەی سالمیش کە سارد و گەرمە، جوانکارییەکی زۆر جوانی دروستکردووە، ئەمەش زۆر خۆشە ئەگەر تۆ وەکو مەل بفڕی و منیش بە تەنیا دەست و پام کە بەستراوە و بەند کراوم ئەمڕۆ...
لە کۆتایی هۆنراوەکەدا ئەڵماس خان دەڵێت:

**مەرهەم خواوەند، کارساز کاران**
**ئێمەیچ بەرکەرۆ جە شار تاران**
**دەماوەن خەمدار، منیش خەمبارم**
**جەو بۆنە مەحرووم دیدار یارم**
**(ئەلبوورز) جای دێوەن، بییەن وە ماوام**
**جەو بۆنە سەرسام، سادار ساوام**
**من و (دەماوەن)، شەرتمان کەردەن**
**ئەو تەم بۆ، من خەم تا وە ڕۆی مەردەن**
**یاران، هامسەران، قەومان، خوێشان**
**هەرگیز جەو بۆنە، جەورم نەکێشان**
**ئینە گشت کەردەی کار گەردوونەن**
**کەس نمەزانۆ حاڵ من چوونەن**
**یە (ئەڵماس) واتەن جە تاران دووستاخ**
**پەی دووری یاران، هەر مەکێشۆ ئاخ**

دیسانەوە سالم دەڵێت:

**ئەگەرچی بولبولی سەرخاری هیجرم**
**تەمەننای عەتری عەینی وەردم ئەمڕۆ**
**قەریحەی شیعرەکەی پێشووم نەماوە**
**ئەوەند خەستە و دەروون پڕ دەردم ئەمڕۆ**
**بە دڵ دەستی دوعای بەرزە کە (سالم)**
**بەرەو شەمسی جەماڵت گەردم ئەمڕۆ**

ئەڵماس خان لە سێ بەیتی کۆتاییدا دەڵێت: یاران، هاوسەرەکان، قەوم و خوێشەکانم، هەرگیز لەو بۆنە (ئاهەنگ)ەدا من لە ڕێگەی ڕاست لام نەدا، ئەمەش گشتی کردەوە و کاری خوای گەورەیە، یان کردەوە و کاری دونیایە، کەسیش نازانێت حاڵ و ئەحواڵی من چۆنە! ئەمەش وتەی (ئەڵماس)ە لە شاری تاراندا بەند کراوە، لە بۆ دووری یارەکانی هەر ئاخ و داخ هەڵدەکێشێت.
بەڵام سالم دەڵێت: ئەگەرچی وەکو بولبول ئەمڕۆ لە سەر سەری درکم لە دووری تۆدا، تەمەننا و ئارەزووی بۆنی چاوەکانی گوڵێکم ئەمڕۆ، لێرەدا مەبەست لە موستەفا بەگی کوردییە، وەکو جاری جاران ناتوانم شیعرت بۆ بنووسم، چونکە ئەوەنە دڵ و دەروون زامار و پڕ دەردم ئەمڕۆکە، بە دڵ سالم دەستی دوعای بەرز کردووەتەوە بەرەو رووی خۆری ڕووت و وەکو گەردی بچووکم ئەمڕۆ بۆ دووریت.
ئەگەر تەماشای ئەم دوو هۆنراوەی سالم و ئەڵماس خان بکەین، تەنها جیاوازییەك هەیە، ئەویش ئەڵماس خان نامەکەی بۆ هەموو دۆست و خزم و کەسوکاری نووسیوە، بەڵام سالم تەنها بۆ موستەفا بەگی کوردی نووسیوە. هەردوو شاعیریش لە کونجی بەندیخانەدا هۆنراوەکەیان نووسیوە.
لەبەر ئەوەی بابەتەکە زۆر دوور و درێژ نەکەمەوە، لێرە بەدواوە تەنها هەندێك لە هۆنراوەکانی هەردوو شاعیر بە بـەراوردی بێ لێکدانەوە و قسە لە سەرکردن دەخەمە ڕوو، ئەڵماس خانی کەنوولەیی لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا کە لە بەندیخانەدا نووسیویەتی، دەڵێت:

**یاران نە بەندم**

**یاران نە بەندم، یاران نە بەندم**
**ئانە گرفتار زەنجیر و بەندم**
**من جە ماوای وێم، ئەورۆ دڵ کەندم**
**توخم بەدبەختی، پەرێ وێم شەندم**
**جە قەوم و جە خوێش، گرد ئاوارە بیم**
**نەک هەر ئاوارە، جگەر پارە بیم**



مەر کە خوداوەند، وە ڕەحمەکەی وێش
ڕزگارم کەرۆ جە دەرد و جە ئێش
ڕزگارم کەرۆ جە ئی بەند تار
هەر ئەو بۆ وە دڵ، چەنیم بۆ وە یار

سالمیش لە هۆنراوەیەکیدا کە لە تاران بووە و تەواو بێزار بووە و دەیەوێ نەجاتی ببێت و چاوەڕوانی دەرچوون دەکات لە شاری تاران دا، دەڵێت:

بە من بێ سینەی سەختم بە قەڵغانی نەزەر ناکەم
نیشانەی تیری خوونرێژت، بجوز لەختی جگەر ناکەم
دەمی نازت بە روو سونحەتی کەتابی تیری غەمزەم بوو
لە ڕێی تێغی جەفاتا، بەعد ئەزین جۆشن لەبەر ناکەم
لە ناوشانت لە چینی زوڵفتا دڵ حەڵقەهای لێدا
خودا گەر وا بدا قودرەت بە من، کەس دەربەدەر ناکەم
ئەگەر پایانی بێ هیجرت لە دەرگاتا، هەتا دەمرم
بە مەحزی جەوری حاجب، یەک وەجب، مەیلی سەفەر ناکەم
لە (ڕەش)کا گەر سەراسەر نوتقی تووتی بێتە سەر هوجووم
لە مەدحی لێوی شیرینت، ئیتر وەسفی شەککەر ناکەم
لە فەردی وەسفی یارا، عارە ناوی مودەعی بردن
لە ڕوشتەی فیکرما خر میهرە، هەم سەلکی گەوهەر ناکەم
لە یاقووتی لەبت یەک بۆسە مایەم بێ دەمێ ئاخر
تەلەف کەم گەر سەر وماڵم لە سەوداتا زەرەر ناکەم
لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بێ لە تارانا
بە هەشت ئەر بێتە دەشتی (ڕەی)، بە ئێرانا گوزەر ناکەم

دیسانەوە ئەڵماس خان لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا دەڵێت:
مەناڵم جە بەند
مەناڵم جە بەند، مەناڵم جە بەند
ئانە شەو و ڕۆژ، مەناڵم جە بەند
ئەی بەند بەوەی شی، ڕیشەی دڵمت کەند
حەق پادشات ئانە جە من سەند
گونام هەر یە بی، کە دانشوەر بیم
پەرێ مەردومم، چوون مانگ و وەر بیم
وەرنە من جە کۆ و بەند تار جە کۆ؟
وەرنە من جە کۆ و ئی گوفتار جە کۆ؟
مەناڵم چوون نەی، جە زیندان پەی پەی
پەرێ بەخت وێم مەواچم وەی وەی
وێنەی نەی سووار، هەردەم مەناڵم
کەس نییەن ڕەحمش بەیۆ وە حالم
ئاه و ناڵەی من جە حەد بەرشییەن
هیچ کەس بە وێنەی من بەدبەخت نییەن

شەو و ڕۆ کارم گرییە و زارییەن
هەر دەرد و ڕەنج و بێ قەرارییەن
پەنام بە خودان، کە شادم کەرۆ
جە ئی بەند تار، ئازادم کەرۆ

سالمیش دەڵێت:

ئەی قیبلەی مورادم ئاخۆ بە ڕۆژگاران
پرسیوتە لە هیچ کەسێ، حاڵی غەریبی (تاران)؟!
بەو سوێندەکەی کە خواردم من هەر ئەوەم کە دیومت
حاشا بکەم فەرامۆشی میساق و عەهدی جاران
تا نەقشی خاترم بێ خورەم بەهاری حوسنت
دەتکێ لە هەوری چاوم ئەشکم بە میسلی باران
شەو تا سەحەر لە هیجرت بۆ من حەرامە خۆ خەو
هەر دێ سەدای گریەم وەک ڕەعدی نەوبەهاران
لاکین لە ئەسڵی کارا ناسیومە حاڵەتی تۆ
سەنگینە گوێ سەماعەت بۆ دادی دەردەداران
تۆ هەر ئەوەی کە چاوت جەرگی بریم بەئیما
من هەر ئەوەم کە عەشقت کردوومی وێڵی شاران
(سالم) لە جەوری دولبەر کۆتاکە شەرحی دەفتەر
تۆ بێ خەبەر لە تاو ئەو، ئەو بێ خەبەر لە یاران

سالم لە چەند هۆنراوەیەکی دیکەیدا ئەو ئازار و مەینەتییەی لە شاری تاراندا دیویەتی و چەشتوویەتی، دەخاتە ڕوو:

١- هۆنراوەی تەریقی عەشقت ئەرون کەم...
کە شەیتانیش ستێزمدا، خەیاڵی دانە قەت ناکەم
لە تاو دەرد و جەفا، ئەم دەفعەیە، لەم داوە گەر بەربم
بە پایز هات، شەوی هیجر و نەسیمی سوبحی وەسڵ ئەنگووت
بەرمدە: ئەی تەبی غەم، وا بەیانە، با سوبوک سەر بم...

٢- لە دیوانی سالمدا کە چاپی کۆنە و لە شاری سەقز دووبارە چاپ کراوەتەوە، هۆنراوەیەکی دیکە هاتووە لە لاپەڕە (١٦) دا و نووسراوە:

شۆڕەزاری خاکی ڕەی ئەمجارە دامەنگیرمە
ڕوو لە هەر وادێ دەکەم، خاری وەکوو زنجیرمە
لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بوو لە تارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی، بە تارانا گوزەر ناکەم
٣- لە دوو بەیتی دیکەیدا کە چەشنی ئەو چەند بەیتەی سەرەوەیە، دەڵێت:

**لەگـەڵ دڵ شەرتـە (سالم) گەر نەجاتم بوو لە تاران**
**بەهەشت ئەر بێتە دەشتی (ڕەی)، بە ئێرانا گوزەر ناکەم**
**خۆزگە ئەمزانی لــە تـارانـا نەجاتم کەی، ئەبێ**
**کۆی یارم (مەشهەدە) یــا مەنزڵم هەر (ڕەی) ئەبێ**

ئەگەر چاوێك لەم چەند هۆنراوەی سالم و ئەڵماس خان بکەین، دەبینین ئەگەر لە یەك چەشندا هاوار و ناڵەیان نەبێ لە بەندیخانەکانی تاراندا، ئەوا بە جیاوازییەکی کەمەوە لە گرتووخانەکانی تاراندا تووشی ئازار و مەینەتی و نارەحەتی و بێزاری بوون....

ئەگەرچی ئەڵماس خان خۆی سەرهەنگی سوپای ئەردەڵانەکان بووە لە سەردەمی نادر شای ئەفشاردا و لە شەڕی نێوان سوپای نادر شا بە سەرکردایەتی ئەڵماس خان و سوپای عوسمانییەکانیش بە سەرکردایەتی تۆپاڵی عوسمانی، ئەڵماس خان لە شەڕەکەدا تووشی شکستییەکی گەورە بووە، خراوەتە بەندیخانەوە، بەڵام تاکو ئێستا نازانرێت سالم بۆچی و لەبەرچی لە تاراندا بەدیل گیراوە، ئەڵبەتە زیندانی کردنی سالم بۆ ئەو سەروبەندەش دەگەڕێنمەوە کە بە ماڵەوە بۆ تاران چوون، ئەگەریش پێشتر چووبێت و لەوێ ماوەیەك بەدیل گیرابێت، ئەوا بۆچوونێکی دیکەیە، بەڵام تاکو ئێستا تەنها ئەوە ڕوونە کە لە دوای ڕووخانی بابانەکان بە ماڵەوە بۆ تاران سەفەریان کردووە.

ئەوەی ماوە لێرەدا باسی لێوە بکەم، ئەگەر تەواوی هۆنراوەکانی سالم و ئەڵماس خان لە بەردەستدا بێت، ئەوا بەڵگە و بۆچوونی ترمان بەدەستەوە دەدەن، هەر بۆیە لەم لێکدانەوە و لێکچوونەی چەند بەیت و هۆنراوەیەکی هەردوو شاعیردا، هەندێ مەبەست و هۆکارمان بۆ ڕوون بووبێتەوە، ئەوا ئەگەر هەموو هۆنراوەکانی هەردوو شاعیرمان لە بەردەستدا ببێت، ئەوا خاڵی گرنگ و بڕوا پێکراوی باشمان بەدەستەوە دەبێت بۆ دیلێتی ئەم دوو شاعیرە لە شاری تاراندا، هیوادارم لە دوارۆژدا تەواوی شیعرەکانی ئەم دوو شاعیرە کە لە بەندیخانەدا نووسیویانە، بدرێتە بەر لێکۆڵینەوەی زانستی و دیلێتی هەردوو شاعیر بە زانستیانە بخرێتە بەر دیدی خوێنەران.

**سەرچاوەکان:**

١- مێژووی وێژەی کوردی: صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، بەرگی دووەم، چاپخانەی چهر تبریز- انتشارات ناجی- بانە کوردستان، چاپی یەکەم، (١٣٧٠خ)، هەروەها مامۆستا هەردەوێڵ کاکەیی لە کتێبی (شاعیر و ناودارانی کاکەیی) دا لە لاپـەڕە (٢٧)ی کتێبەکەیدا باسێك لە خان ئەڵماس خانی لوڕستانی دەکات و ئەم شیعرەی سەرەوە دەهێنێت، مامۆستا هەردەوێڵ کاکەیی خۆی نووسخەیەکی لەو کتێبە بۆ ناردم و پێی ڕاگەیاندم کە کاتی خۆی ئەو شیعرەی بەناوی خان ئەڵماس خانی کەڵهورەوە بە هەڵە بڵاوکردۆتەوە و هی (ئەڵماس خانی کەنوولەیی)یە، لە کتێبەکەی مامۆستادا (١٢) بەیتی لێ بڵاوکراوەتەوە.
٢- دیوانی سالم: چاپی چاپخانەی موحەممەدی لە سەقز.
٣- بەشێك لە دیوانی (شیعرەکانی) سالم: کاروان عوسمان خەیات، ٢٠١٢.
٤- دیوانی کوردی: محەمەد مستەفا "حەمەبۆر"، بەرگی یەکەم و دووەم، لە بڵاوکراوەکانی ئاراس، ٢٠١٠.





# بیمارانی ئەمشەو

هیلاکی جانی بیمارانە ئەمشەو(*)
سیەهـ وەك تورڕەیی یارانە ئەمشەو
لە چاو ئەشك و لە دڵ ئاهم بێروون دێ
دەڵێی تۆفانی با و بارانە ئەمشەو
لە نووسخەی مووتە یا تەئسیری بەختم
جیهان هەر دەڵێی قەترانە ئەمشەو
لە گوێما دەنگی دەقولبابی دڵ دێ
خەیاڵی یارەکەم مێوانە ئەمشەو
بینات کرد عەهدەکەی زووحاکی تازی
لە تورڕەت موو بە موو مارانە ئەمشەو
لە مەیلی سەردی قەهری وەك سمووومت
لە باغی دڵ گڵاڵو ڕێزانە ئەمشەو
لە گەرمی دڵ گوڵی شادی دەڕوێ
شکۆفەی غەم لە نەو خەندانە ئەمشەو
شەبەیخوونی نیگەهـ حەڵقەی دڵی گرت
بەجوز غەم هەرچی بێ تاڵانە ئەمشەو
لە رووی عەکسی خەیاڵی لەعلی لێوت
دوڕی ئەشکم وەکو مەرجانە ئەمشەو
لەلای (سالم) ئەگەر ئەکلە وە گەر شورب
بەبێ تۆ دوور لە تۆ سندانە ئەمشەو

سالم



# زوڵفی دولبەر

لە مەهتابا کە دڵ دی ئەگریجەی وەك عەقرەبت ئەمشەو(*)
گورێزی دا لە عەقرەب، کەوتە چاهی غەبغەبت ئەمشەو
لە وەسڵام و لە بەدگۆ خەوفناکم، ئەی فەلەك ئامان،
بە کامی من بدە تەغیری نەحسی کەوکەبت ئەمشەو
بەڵێ، ئەی دڵ ئەگەر هەم داستانی زوڵفی دولبەر بێ
لەناو جەمعی پەرێشانی جەمیعی مەتڵەبت ئەمشەو
لەسوجدەی خاکی جانانە، تۆ ئەی دڵ غەفڵەتت تاکەی؟
دەترسم وەرگەڕابێ مولحید ئاسا، مەزهەبت ئەمشەو
وەکو ئەشکم پەیاپەی خوێنی ئاڵم، ئەی عیقابی غەم
بەسەر جەرگا لە دڵ دەرژێ لە زەربی میخلەبت ئەمشەو
سەحەر گەر بۆ شکارم دێیە سەحرا، با مەرەخەس بم
حەنایی کەم بە ئەشکی دیدە سمی مەرکەبت ئەمشەو
بە پەنهانی لە کۆی یارا سەگ ئاسا مەسکەنت دەسکەوت
تەشەکورکە، گەلێ باڵایە (سالم) مەنسەبت ئەمشەو
عیلاجی ئێشی دڵ ناکا بە سەد مەرهەم، حەکیم ئەمشەو
لە زەخمی تیری موژگانت بە نەوعێ پۆستەریم ئەمشەو
لە لەب نەقدی حەیاتم خوون بەهای یەك بۆسەی داناوە
ئەگەر یاری قەمەر تەلعەت قەبووڵ کا، موشتەریم ئەمشەو
خەتایە گەر هەوای بۆی عەتری کەم، تا حەیاتم بێ
ئەگەر بێنێ لە موشکین زوڵفی تۆ، بۆی نەسیم ئەمشەو
هەتیتەی دڵ بکا گەر تەجروبەی قەدت لە باریکی
بەرابەر ئەو دەبێ مووی کاکۆڵی هیندووی زوخیم ئەمشەو
لە خاکی ئاستانەی دولبەرا ئیفتادەم و شادم
دەگاتە تاقی کیسرا رەفعەتی جێگەی سەگیم ئەمشەو
سیحری جێی سوجدە شاهیدە بێ، بە ئەشکی سوورخ و رووی زەردم
لە خاکی کۆی تۆ ئالوودەیە مەرجان و سیم ئەمشەو
ئەگەرچی ئیحتیاجی، روو لە قاپی کەس مەکە (سالم)
بە ئومێدی کەرەموڵڵا، خوداوەندی کەریم ئەمشەو

* * *

قامەتت سەرووی رەوانە بە حوسێن
عاریزت باغی جینانە بە حوسێن
شەربەتم زەهرە لە دووریت بە حوسن
زیندەگیم دەردی گرانە بە حوسێن
غەیری دووری نییە سەیل و یەرەقان
هەر فیراق قابیلی جانە بە حوسێن
هێرشی لەشکری غەم، نەوعی یەزید
وا لە دڵ زەخمی زەمانە بە حوسێن
دڵ لەبەر تیری نیگاهی غەمزەت
رووبەڕوو میسلی نیشانە بە حوسێن
(سالم)ی توشنەی هیجرت بە عەلی
پەیڕەوی رێگە رەوانە بە حوسێن

# خەیاڵی وەسڵی دولبەر کەم

لە کونجی میحنەتا هەر شەو خەیاڵی وەسڵی دولبەر کەم(*)
وجوودم وا بە جارێ دێتە جونلاش، وەختە پەڕ دەرکەم
لە ئەوەڵ حەرفیا وەك دڵ لە کاغەز بەر دەبێ ئاگر
ئەگەر شەرحی شەرارەی ناری هیجرت سەبتی دەفتەر کەم
تەڵاشی تەی راهی کەعبەیی کۆی یارە، مەقسوودم
منی بێ دەست و پا، لازم کە پا بۆ ئەم رەهە سەرکەم
لە ئەفلاکی خەیاڵا کەوکەبی رووی یارە تا قوتبم
بە زوڵماتی شەوی هیجرا، رەهی کۆی ئەو ئەبێ دەرکەم
سەرئەفگەندەی حزووری سەر بڵندانی قیامەت بم
سەرم تا دانەنێم، شۆڕی ویساڵت گەر لە سەر دەرکەم
بە نەڕادی فیراقت نەقدی جان ئاخر ئەدورێنم
بە خاڵی میهرەی وەسڵت، ئەگەر سەد دەفعە شەش دەرکەم
قەبووڵی نرخی بۆسەی لەعلی رومانی لەبت ناکەم
لە ئەشکم پڕ بە دامانت ئەگەر یاقووتی ئەحمەر کەم
لە سەر ئەم مەزهەبەم (سالم)، بە مەخفی روو بە رووی مەتڵەب
وەکو هیندووی گێسووی هەر سەحەر، تەعزیم ئازەر کەم

سالم

# دڵی من تەنگە

دوور لە خاکی سەری کۆی سەنما تا سەفەریم
لە بەهەشتێکی وەك ئەم شارە لە حاڵی سەقەریم
گەرچی بە ئەو سیعەتە، ئەم مولکە، وەلاکین بێ تۆ
دڵی من تەنگە بە قەد دیدەی نامەردی لەئیم
زەمزەمەی عەشقە لەناو مەسیری وجوودم هەمە جا،
ئاتەش ئەفسانە، هەناسەم وەکو سەعبانی کەلیم
ئاگرێ بوو وەرەقی کەوتە دڵی مورغی چەمەن
دووگمەی توکمەی هەر غونچە ترازا بە نەسیم
تالبم دیدەیی تۆ بی بە شفای جۆی دڵ رێش
گەرچی نایبا ئەبەد کاری حەکیمێ لە سەقیم
خاڵی تۆیە کە لەناو حەڵقەی زوڵفا بە هەوەس
نایە ناو دائیرەی موشتاقی ئەزەل نوقتەی جیم
لافی لێداوە بەبۆ نافی گوڵی روومەتی تۆ
ڕوو رەشی کردووە تەئسیری گوناهانی عەزیم
تورکی تیر ئەفگەنی شیرین دەهەنی سیم زەقەن
سەر سوڵحی هەیە، گەر دەرحەقی یارانی قەدیم
گەر بە قیمەت نگەهێ کا لە رووخی زەڕە و سروشك
دیدەی دەمی رەشوەتی یەك غەمزە بە دامەن زەڕ و سیم
کافییە یەك نیگەهت بۆ دڵی توشنەی (سالم)
دەستەکەم ناگرێ هەنگامی کەرەم، مەردی کەریم

* * *

